## پێشەکی

**الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلامُ على خاتم الأنبياء والمرسلين وعلى آله وصحابته الكرام وسلم تسليماً الى يوم الدين.**

نازانم و نەم بیستووە ، تا ئەوڕۆ کەسێ لە نێو گەلی موسڵمانی کورد نووسینێکی لە ژێر ئەم ناونیشانەیە نووسیبێ و بڵاوی کردبێتەوە ، ﴿ ئیسلام کوردی دوا نەختستیە ﴾ من تاکە کەسم هەستاوم ڕاستیەکی بزر لە نێوان هەزاران ڕاستی بزر یا شاردراوە بهێنمەوە بەر چاوی خوێنەرانی بەڕێز و پەردەی لەسەر لابدەم و ببێ بە پێشەکی و ڕێخۆشکەرێك بۆ چەندان زاناو داناى موسڵمانی کورد کە چاکتر لەمن و ڕاستر لەمن ڕوونی بکەنەوە.

ئەو قسەو قسەلۆکەی ( propaganda – إعلام ) کە ئەمڕۆ بەجارێ پەرەی سەندیە کە گوایە ئیسلام کوردی دواخستیە لە دەمێکە بڵاو بۆتەوە کە دەگەڕێتەوە سەردەمی داگیرکەرانی عێراق و کوردستان لە لایەن ئینگلیزەکان لە ساڵی ١٩١٧ ز .

ئاشکرایە داگیرکەرێکی وەك ئینگلیز، بەهێز و توانا و فێڵبازی توانای هەیە کە کاریگەریەکی زۆری هەبێ لەسەر بیرو باوەڕو هەڵسوکەوتی تێکڕای ڕۆڵەکانی گەلی داگیر کراو یا زۆرینەیان و بەفێڵ و فێڵباز خۆی و هێزی زانایی و هێزی لەشکریەوە ڕایانکێشێتە سەر ئەو بیر و باوەڕەی کە خزمەتی بەرژەوەندیەکانی خۆی بکا . شتێکی سەیرە هەزاران ساڵە بەدواکەوتینە و لەدواوەی گەلانین، ئەوەد ساڵێکیشە وادەزانین ئاینی ئیسلام دوای خستینە !

**ئینگلیزە داگیرکەرەکانی کوردستان ،لەیەکەم ڕۆژانی داگیرکردنیان دەستیان کرد بە دوژمنایەتی ئیسلام بە هەموو ڕێگەیەك لە ڕۆژانی یەکەمیان لە کوردستان ئینجیلە گۆڕدراوەکەیان بەخۆڕایی بڵاوکردەوە .**

**من وادەزانم ئێمەی کورد دواکەوتووترین گەلانی جیهانین ، چونکە خاوەنی دەوڵەتی سەربەخۆ و هێزداری خۆمان نین لەوەتەی خاکی**

کوردستانمان تاوەدان کردیتەوە بەر لە-هەزاران ساڵ ، ئایا بۆ خاوەنی ئەو دەوڵەتە نین و چ شتێك ڕێگرمان بووە ؟ ئایا ڕاستە ئاینی ئیسلام وەك دوژمنانی ئیسلام هەڵیان خەڵەتاندینە ، هۆکاری نەبوونی ئەو دەوڵەتەیە ؟؟

ئیسلام هێندە ئاینێکی ڕاست و پیرۆزە و بەناوبانگە هەرگیز نەدەبا پێویست بە پێناسە کردن بکا ، بەڵام ئەگەر باوك و منداڵ پەنجا ساڵێك یا کەمتر لەیەك دابڕان سەرو سۆراغیان لەلای یەك نەما ، هەر کاتێك بەیەك گەیشتنەوە دەبێ خۆیان بەیەکتر بناسێننەوە یا بەیەکتریان بناسینەوە .

ئاینی ئیسلام ڕاستیەکی ڕەهایە ( حقیقة مطلقة ) چونکە لەلای خوایەکی ئەوتۆ هاتووە بۆمان کە داهێنەری هەموو گەردوونەکان و بوونەوەر و گیانلەبەرە ، کەواتە چۆن دەبێتە هۆکاری دواکەوتن بۆ مرۆڤ لەکاتێکدا کە مرۆڤ لەخۆشەویسترین داهێنراوەکانییەتی و بەدەستی پیرۆزی خۆی لە نەبوو دروستی کردووە ، مادام خۆشەویسترین دروست کراوی دەستی خۆی بێ هەڵبەت دەبێ چاکترین و ڕاسترین و پیرۆزترین بەرنامەی بۆ بنێرێ کە هەمیشە مایەی سەرچاوەی سەرفیرازی و پێشکەوتنەکانی بێ هەتا هەتایە .

لەبارەی ڕێزلێنانی لە مرۆڤ دەفەرموێ: ﴿ ولَقد كرمنا بَني آدم و حملناهُم في البَرِّ والبَحرِ ورزقناهم من الطَّيبات وفضَلناهُم على كثيرٍ ممن خلقنا تفضيلاً ﴾ ﴿ الأسراء (٧٠) ﴾ یا دەفەرموێ: ﴿ لقد خلقنا الأنسان في أحسنِ تقويم ﴾. کورتە مانای هەردوو تایەتەکە وادەبەخشێ کە مرۆڤ بەتێکڕاو بە تایبەتی خۆشەویسترین دروستکراوی خوای گەورەیە.

لەبەر ئەوەی مرۆڤ گەورەترین خۆشەویستی خۆیەتی ، دەبینین لەبەرنامە پیرۆزەکەی هەموو هۆکارەکانی پێشکەوتن و سەرکەوتن و هێزی پێ بەخشیوە وەك

(علم) زانایی لەیەکەم چرکەی گیان وەبەرهێنانی زانایی فێرکرد کە سەرو سەرچاوەی هەموو پێشکەوتنەکانە لەسەر ئەرز وە دەفەرموێ (وَعلَّمَ آدَمَ الأسماءَ كلَّها) البقرة (خلقَ الأنسانَ عَلَّمَهُ البيان) (الرحمن ٣،٤) يرفعُ اللهُ الذين آمنوا منكم والذين أوتوا العلمَ درجات) (المجادلة ١١) .

هەروەها عزەتی (عزَّە) پێ بەخشی کە ئەویش یەك لە سیفەتە پیرۆزەکان و گەورەکانی خۆیەتی بۆ ئەوەی بەدرێژایی ژیانی سەرشۆڕی و نۆکەری و بەندایەتی بۆ غەیری خوا لە کەس قبوڵ نەکا ، خوای گەورە خۆی (عزیز )ە هەمیشە سەر شۆڕی دەسەلاتی بۆ گەورەترین و خۆشەویسترین دروستکراوی خۆی ناوێ کە مرۆڤە ، مانای (عزیز) دەستەوەستان بەرامبەر هیچ شتێ ناوەستێ و هیچ شتێ پێی ناوێرێ و بەهەموو شتێ دەوێرێ. خوای گەورە خۆی (قويٌّ عزيز)ە ، واتا بەهێزیشە هێزەکەی لەبیرو بۆچوونی کەس دا نییە ، کەواتە هەمیشە بەهێزی بۆ موسڵمانان دەوێ هەروەك عزەتی(عزَّە) بۆ ویست (ولله العزَّةُ ولرسولهِ وللمؤمنين ولكنَّ المنافقين لايعلمونَ) (المنافقون ٨) وە لە بارەی هێز بۆ موسوڵمانان دەفەرموێ (وَأعِدُّوا لهم ما آستطعتم من قوَّة ومن رِباط الخَيل تَرهبونَ به عدوَّ اللهِ وعَدوَّكم وآخرين من دونهم لاتعلمونهمُ الله يَعلَمُهُم....) الأنفال. هەروەها داواشی لێکرد کە هەمیشە نامادەبێ بەرەنگاری دوژمنانی بێتەوەو لەبەریان دانەینی و نەبەزی لەو بارەیەوە دەفەرموێ : (وقاتلوا في سبيل اللهِ الَّذينَ يُقاتلونكم ولا تعتدوا إنَّ الله لا يُحبُّ المعتدينَ). (البقرة ١٩٠).

ئەوەی پێشتر کورترین پێناسەی ئیسلامە بۆ ئەو موسڵمانە کوردانە کە تا ئێستا شتێك لە بارەی ئاینی ئیسلامی پیرۆز نازانن، شایانی باسە پێناسەکردنی تەواو بەچەندان کتێبی گەورە تەواو نابێ و لەتوانای یەك زانای موسوڵمان و دەیان و سەدان زانا دانییە کە بە پێناسەی تەواو هەستن .

## بەسە با چیدی گاڵتە بە خۆمان نەکەین :-

گەورەترین هۆکاری دامەزراندن و دروست کردنی دەوڵـەت ، گـەل خۆیـەتی، لەهەرکوێ یا لەهەر کاتێ گەل هەبوو دەبێ دەوڵەتیش دروست بـێ ، بەمـەرجێ ئەو گەلە خۆی بیەوێ ببێ بـە دەوڵـەت و سـوربێ لەسـەر دامەزرانـدنی ، گـەل کەخۆی ویستی ببێ بە دەوڵەت هیچ زل هێزێك نییە لە جیهان ڕێگـەی لێ بگـرێ وەك هەموو گەلانی سەر زەوی لەوەتی خـوای گـەورە خـەڵقی کردینـە، وەئەگـەر گەلیش خۆی ویستی لەسەر دروستکردنی دەوڵەت نەبێ دیسانەوە هیچ زل هێزێك نیە بتوانی بیکا بە دەوڵەت ، چونکە ڕێوی بەکەس نابێتە شێر، بێگومان ویستی گەلان لەسەر دروستکردنی دەوڵەت سیفەتێکی سروشتیە وەختە بڵـێم نـان و ئـاو چەند بەلایانەوە پێویستە دامەزراندنی دەوڵەتیش هێندە بەلایەنەوە پێویستە لـەو ڕووەوە تەنها گەلی کورد لە ریز پەڕیوە ( شاز ) ڕاستە کە دەڵێن هەموو بنەماو بنچینەیەك ڕیزپەڕیوێکی هەیە، لەو بنچینەو بنەمایە لەڕیزپـەڕیوە کـە ئێمـەی کوردین ئەگەرچی لەکۆنترین گەلانی سەرزەوین ، بەلاّم ( وەك دەبینین ) تا ئێـستا نەك دەوڵەتێکی سەربەخۆمان نییە بەڵکو دەوڵەتۆکەشمان نیە.

هەموو هۆکارەکانی دروست کردنی دەوڵەت لەئاستی بوونی گـەل و ویـستی گەل لەسەر دروست کردنی دەوڵەت وەك تنۆکێ ئاوە لە دەریایێ وە لە دواتر بـۆت ڕوون دەبێتەوە ، تاوان و کەم و کوڕی خۆمان بەمل کەسـانێکی دیکـە دابـدەین و جارێك بڵێین ئاینی ئیسلامی پیرۆز هۆی دواکەوتنمانە کـە بێگومـان سەرچاوەی هـەموو پێـشکەوتنەکانە لـە ژیـانی مـرۆڤ ، جـارێکی دیکـە بڵـێین گـەلانی دەوروبەرمان لێنەگەڕاین ببین بە خاوەنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ، خوێنەری بەڕێز بۆ بەدرۆخستنەوەی ئـەو درۆ و بۆچـوونانە بەهێواشـی و بەئارامـەوە شـۆڕبەوە نێـو

لاپەڕەکانی ئەو کتێبۆکەیە ، خوا دەزانی لە سوپاسیش بەولاوە هیچ شتێکم نییە پێشکەشت بکەم .

خوێنەری بەڕێز ئایا دەزانی بۆ هێندە بە پەرۆشم بۆ دەولەتێکی کوردی سەربەخۆ کە هەر لەسەرەتای مێژووەوە دەست بەرداری بووینە و نەمان توانیوە دەستما پێی ڕابگا ، چونکە دەولەتی هێزدارو سەربەخۆ دوای ئیمان بە ئیسلام سەری هەموو پێشکەوتنەکانە بەداخەوە ئێمە لێی بێ بەشین و تاکو ئەمرۆش بە وردی و بەڕاستی لە هۆکارەکانی نەبوونمان بە دەولەت نەکۆلیتەوە وەك پێویستە ، ئەو نیعمەت و پایەو پلە و سەربەرزیەی کە گەل دەستی دەکەوێ لەپەنا قەلا بەرزەکانی دەولەت لەپەنا هیچ شتێکی دیکە دەستی ناکەوێ، ئەوەتا پێغەمبەری مەزن و خۆشەویستمان لەیەکەم ڕۆژی گەیشتنی بەشاری مەدینەی پیرۆز یەکەم بەردی بناغەی دەولەتی ئیسلامی بۆ موسلمانان دامەزراند ، چونکە دەی زانی کە دەولەتێکی ئیسلامی مایەی عیززەت و سەربەرزیە بۆ موسلمانان ، وە فێری کردین کە ئێمەش لەسەر ڕێ و شوێنی ئەو بڕۆین و دامەزراندنی دەولەت هەرگیز فەرامۆش نەکەین ، چونکە بەبێ بوونی دەولەتمان ناگەین بەهیچ ئاواتێك و دەولەتێك لە نیعمەتە هەرەگەورەکانی خوای گەورە بۆ گەلانی موسلمان و ناکرێ بەهیچ جۆر فەرامۆش بکرێ ، چونکە بەبێی ئەو دین و دونیامان لەکیس دەچێ بەمسۆگەری و دامەزراندنی دەولەت لە ئسولە هەرە گەورەییەکانی ئاینی ئیسلامی پیرۆزە، کەچی ئێمە کردوومانە بەسەلکی کافری و لە هەموو کات و سات بەرد بارانی دەکەین بەو چەشنە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خۆمان پتر لە دامەزراندنی دوور دەخەینەوە ، زۆر بەداخەوە تاکو ئەورۆ نازانین بەرژەوەندیمان لە چ دایە تا دەست بەو شتەوە بگرین و بەدل و بەگیان و بەسامان بیپارێزین ، دە خوێنەری بەڕێز بۆم شۆڕبەوە نێو لاپەڕەکانی ئەو کتێبۆکەیەو (وەك پێشتر گوتم) بزانە ڕاستی لە کوێوەیە ؟ دیسانەوە زۆر سوپاس.

# ئایا صدام حسێن لە پەنا ئیسلام فێری لێکردین؟

لە وەڵاما دەڵێین نەخێر ، چونکە کەس نییە لە دونیا نەزانێ نە صدام و نەحیزبەکەی فریان بەسەر ئاینی ئیسلامی پیرۆزەوە نەبوو، وەهەمووومان دەزانین دامەزرێنەری حیزبی بەعس لەلایەن کابرایەکی سوری دایك جولەکەی باوك دیان ( نصراني ) لەساڵی (١٩٤٧) دامەزرا کە ناوی ئەو دامەزرێنەرە (مێتشیل عفلق) بەناوی (حزب البعث العربي الأشتراكي) بە پارتی ژیانەوەی عەرەبی سۆسیالیست) لە ژێر دروشمی (أمّە عربیە واحدە ژات رسالە خالدە) (ئێمەی عەرەب یەك نەتەوەین خاوەنی یەك پەیامین)، وە هەموو دونیا دەزانێ کە ئایدیۆلۆجیەتیان و بیرو باوەڕیان لەسەر توندو تیژی و کوشتن و بڕین هەڵێنراوە ، زۆر بەئاشکراو بەبێ شەرمانە دەیانگوت حزبُ البعث: (حزبُ دعائمهُ الجماجم والدَمُ .... تَتهدَّم الدُّنيا ولا يَتهدَّمُ) حزبی ئێمە حیزبێکە کۆڵەگەکانی لەکەللەسەر و خوێن هەڵێنراوە جا کەواتە دونیا دەڕمێ بەڵام ئێمە ناڕمێین و ناڕوخێین) کەنگێ ئەوە دروشمی ئیسلام بووە؟ ئەم دێرە شیعرە لە کتێبی (العراق دولە المنقمە السریە) لەنووسینی (حسین علوان).

بەکورتی حیزبی بەعس لەسەرەتای دامەزراندنی لە عێراق تا ڕۆژی نەمانی صدام حسین لەسەر کورسی فەرمانڕەوایی لە (٩/٤/ ٢٠٠٣) پیشەی کوشتن و بڕین بووە جگە لەهەندێش لە هیچ هەڵس و کەوتێکیان، لەهیچ کارو کردەوەیەکیان، لەهیچ پرۆژەیەکی ئابوری و عەسکەری و سیاسی و کۆمەڵایەتی لەگەڵ ئاینی پیرۆزی ئیسلام تێکیان نەکردیتەوە. هەمیشە پڕ بەدەنگیان هاواریان دەکردو دەیانگوت: (الوحدة والحرية والاشتراكية ) یەکگرتنەوەی عەرب لەژێر ئاڵآو ئایدیۆلۆجیەتی بەعس ئازادی ، بەرەڵایی جنسی، سۆسیالیستی مارکسی. ئیتر ئەوە هەرە دروشمی گەورەیان بوو ، هەموو هەوڵ و تەقەلایان بۆ وەدیهێنانی ناوەرۆکی ئەو سێ وشە بۆگەنەیە بوو، تەنانەت هەموو جارێکیش کە هێرشی دڕندانەی خۆیان بۆ سەر کوردستان دەهێناو ناوی هێرشەکانیان بەناوی ئیسلامی ناو دەبرد وەك (العمليات الانفال) يا (عمليات توكلنا على الله) بۆ تێکدان و ناوبەدکردنی ئاینی ئیسلامی پیرۆز بوو ، شایانی وەبیر هێنانەوەیە بەعسی فاشی

لەو دوو هێرشە سوپایە کە دوا پلەی دڕندایەتی خۆی تێدا بەکارهێنا هەروەها لەڕێگەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لە ساڵی (١٩٨٨) توانی گەلی کورد نیمچە قەلاچۆیەك بکا .

لە ڕاستیدا کافرو دڕەندەی وەك حیزب و حکومەتی بەعس کەم هەبووە لە جیهان و لە مێژوو ، لەگەڵ ئەوەشا دوژمنان و مونافیقانی ئیسلام لەناو گەلەکەمان بەموسوڵمانیان لەقەڵەم دەدەن تا خۆیان و خەڵکی ساویلکەو نەزانیان پێ لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەڵگەڕێننەوە، ئەگەرنا هەموومان دەزانین کە بەعس و حکومەتی بەعس نێوان ئەرزو ئاسمان لەو ئاینە پیرۆزە دوور بوون .

ئاینی ئیسلام هەرگیزا و هەرگیز ڕێگە بەهیچ موسوڵمانێك نادا کە شانە مێرولەیەك بەبێ هۆی شەرعی و بەهەوەس تێکدا ، هەرگیزا و هەرگیز ڕێگە بە هیچ موسوڵمانێك نادا گیان لەبەرێك بەهەواو هەوەس بکوژێ ئەوەتا پێغەمبەری خۆشەویستمان (علیه الصلاة والسلام ) دەفەرموێ (لَعن الله مَن آتّخذ شیئاً فیه روح غرضاً) مانای: نەفرەت لەکەسێ دا کە هەربەهەوەس نیشانە لە شتێ دابگرێ کە گیانی تێدا، وەك ئەوە نیشانە بەچەك لەچۆلەکەیەك دابگرێ و بیکوژێ بۆ ئەوەی بزانێ دەستی ڕاستە یان نا !!

ئەی گەر خوای گەورە ، لەسەر زەمانی پێغەمبەری ڕاستگۆمان لەعنەت لەکەسێ بکا لەسەر گوناهێکی ئەوها بچووك ئەی دەبێ چ حوکم و بڕیارێکی هەبێ لەبەرامبەر صدام حوسێنێك کە بەسەدان و هەزار موسوڵمانی کوردی شەهید کردیە هەر لەسەر ئەوەی کە بەزمانی کوردی خوا خەڵقی کردیە، دەبێ چ حوکمێکی هەبێ بەرامبەر صەدامێك کەلەماوەی چەند حەفتە زیاتر لە سەدو هەشتا هەزار موسوڵمانی کوردی شەهید کردینە کە بەدەیان هەزاریان ژن و مناڵ و پەککەوتەبوون؟

هەموو موسوڵمانێك دەبێ زۆر چاك بزانێ کە ئاینی ئیسلامی پیرۆز هەرگیز بەرپرسیار نییە لەبەرامبەر تاوان و گوناحی هیچ کەسێك کە پێناسەی لەسەر ئیسلامە واتە هەر بەپێناسە موسوڵمانە، دەبێ زۆر چاك بزانین کە ئیسلام شتێکەو موسوڵمانان شتێکی ترن کە مادام لایان دابێ و لادانەکەش لەهەموو کەس ئاشکرابێ.

# مرۆڤ کەی دەبێ بەرنامەی ژیانی تاوانبارکا؟

مرۆڤ کاتێ دەتوانی بەرنامەی ژیانی تاوانبار بکا واتا: ئەو بەرنامەی کە کردوویەتی بە ڕێبازی ژیانی ، ئەو بەرنامەیە چی چاکی فێرنەکا لەسەر هەڵەو تاوان و ناپیاوەتی و نامرۆڤایەتی پەروەردەی بکا ، بێگومان لەو حاڵەتەش ناتوانی تاوانباری بکاو دەستی لێ هەڵبگرێ تا بەهەڵەکانی نەزانێ و تۆبە نەکا لە پەیڕەوکردنی و بە تەواوی پەشیمان نەبێتەوە ، بۆ نموونە: مرۆڤێکی مارکسی کە مارکسیەتی کردە بەرنامەی ژیانی و کاری پێکرد لەدواتر زانی کە مارکسیەت مرۆڤ بەرەو ئیلحاد دەبا کەبەرو ئیلحادیشی برد ئیتر دەرگای هەموو تاوانەکانی دونیا لەخۆی دەکاتەوە و لەنێویان نقوم دەبێ ئەوجا با یەکسەر ببێ بەدوژمنی و لێی هەڵگەڕێتەوە و ئەو کەسانەشی لێ هەڵگەڕێنێتەوە کە ئەو فریوی داین و کردینی بە مارکسی ، یاخود کە بوو بە دیموکراتی و دیموکراتیەتی کردە ڕێبازی ژیانی و دواتر زانی کە دیموکراتیەت تەنها یەك مانای هەیە و یەك تاکەشت فێری مرۆڤ دەکا، کە ئەویش جڵەو بەرەڵاکردنە بۆ هەوار هەوسی مرۆڤ و چیتر نا ، وەتەنها یەك شت لە مرۆڤ قەدەغە دەکا کە ئەویش هەڵگەڕانەوەیە لە دژی حکومەت و دەسەڵاتی ، ئەوسا پێویستە لەسەری کە بەزووترین کات لێی دوور کەوتەوەو دژایەتی بکا، بەڵام چۆن دەبێ ئێمە لە ئاینی پاك و پیرۆزی ئیسلام هەڵگەڕێینەوە لەکاتێکدا هەموو جیهان لەڕابردوو ئێستاو داهاتوو دەزانێ هەر لەبچووکترین چاکە تا دەگاتە گەورەترین چاکە ڕوونی کردیتەوە و داوامان لێدەکا بەپێی توانامان ئەنجامیان بدەین ، هەروەها لە بچووکترین خراپە و تاوان و گوناح و هەڵە بۆی بەیان کردینەوەو بەتوندی ئەهیمان لێ دەکا کە نزیکیان نەکەوینەوە وە هەرکاتێ ڕووبەڕووی تاوانێکیش بووینەوە یا هەڵەیەك یەکسەر لێی بگەڕینەوەو تۆبەی لێبکەین، تا نەچین نێو بەندیخانە تۆقێنەرەکەی خوای گەورە

که ئاگری دۆزەخە، ئیتر بۆ دەبێ لە پەنا موسوڵمانان مونافیق و دوو ڕوو، سێ ڕوو ، تەنها بە پێناسە موسوڵمان ئەو ئاینی وا بەڕێز و ڕاست و پیرۆز و چۆن لەگەڵ سروشت و فیترەتی مرۆڤ تاوانبار بکرێ؟ جوت دەبێ خۆی بکا بەشەمشەمە کوێرەو حەز بە کوژاندنەوەو ئاوا بوونی خۆر بکا، ئەو چیە؟ ئەو چاوی نابینێ؟ زۆرمان بیستووەو دیوە فلان سەرکردە یەکجار نیشتمان پەروەرو گەل پەروەر بووە دواتر بوویتە بۆگەنیترین خائین، ئایا جوانە ئەوانەی کە حەز بە نیشتمان پەروەری و گەل پەروەری دەکەن لەرقی ئەو خائینە گەل پەروەر و نیشتمان پەروەری بەلەعنەت کەن؟ ئایا ڕێبازێکی پیرۆز لەرقی بێ ئەمەك و بێ وەفایەك دەبێ بەلەعنەت بکرێ یا پێشێل بکری؟ بێگومان نەخێر. ئاینی ئیسلامی پیرۆز خیانەت و خۆفرۆشی حەرام کردیە و بەتوندی نەهی لێکردیەو دۆزەخێکی ئەبەدی ( الله اعلم ) بۆ خائینان دانایە ئەگەر لەسەر خیانەتەکەیان مردن و تۆبەیان نەکرد، لێرەدا پرسیار دەکەین: ئایا ئەگەر موسوڵمانێك خیانەتی کرد ڕەوایە بۆ هیچ کەس ئاینەکە تاوانبار بکا ؟ لەکاتێکدا زانی کە حوکمی ئیسلام لە کیتاب و سوننەت بەرامبەر خائینان چیە؟ تاوانبار کردنی لەو شێوەیە وەك تاوانبار کردنی باوکی یا برای بکوژە (قاتل) لەدادگا لەلایەن حاکمی جینایات ، ئەو کاتە ئەو جۆرە حاکمە بە حاکمێکی قەرەقووشی ناودەبرێ ، ئەو قەرەقوشەی کە لەڕۆژگاری ڕابردوو یەکجار بەناوبانگ بووە بەنەزان و ستەم کارو زۆردار.

## ئیسلام ڕەهبەرو مامۆستای هەموو گەلانە هەتا هەتایە

وەنەبێ ئەو چەند ئایەتە پیرۆزەی کە بەهانام هاتن بەڵگە بن لەسەر پیرۆزی و ڕاستیەکی ڕەهایی (حقیقة مطلقة ) کە هەمیشە لە خزمەتی گەلانی سەر ئەرزە لەورۆژەوەی کەدابەزیوەتە سەری ( بە ئیزنی خوای گەورە بەویستی ئەو ) تا ئەو ڕۆژەی کە ئەرز دەگۆڕێ بەئەرزێکی تر، بەڵام گەلان یاخود مرۆڤ کە خۆیان پێی ڕازی نەبن و خۆیان پێشوازی لێنەکەن و پەیڕەوی نەکەن و تێی نەگەن ئیتر ئەو چ تاوانێکی هەیە ؟

ئاینی ئیسلامی پیرۆز نەك گەلەکەمانی دوا نەخستووە ، بەڵکو ئێمەی موسوڵمانی کورد هەتا هەتایە بەسەرو ماڵ قەرزاری ئەو ئاینە پیرۆزەین، چونکە بەر لەهاتنی ئەو ئاینە پیرۆزە ئێمە خاوەنی هیچ جۆرە شارستانیەك نەبووینە وەك یۆنانەکان و ڕۆمەکان و چینیەکان و فارسەکان و میسریەکان و باقی گەلانی خاوەن ئیمپراتۆریەت و ژیاری وشارستانی ، بەدرێژایی مێژوو غەرقی نێو دەریای جەهالەت و دواکەوتن و کەس نەناسی بووین ، بەش بەحاڵی خۆم تەحەددای هەموو کورد دەکەم ئەمڕۆ کە ژمارەکەی بەدەیان ملیۆنە بتوانن ناوی دە شاعیر و دە نووسەر و دە سەرکردە و دە زانای کوردم بۆ بژمێرن کە بەر لە ئیسلام ئێمە خاوەنیان بووبین و ڕۆڵەی گەلەکەمان بووبن ، بەڵام لەدوای ئیسلام سوپاس و ستایش بۆ خوا بووین بەخاوەن سەدان بەڵکو هەزاران زانای بەناوبانگ و نووسەر و شاعیر و ئەدیب و سەرکردەی مەزنی وەك ئەحمەدی خانی و حاجی قادری کۆیی و سالم و کوردی و نالی و مەلای جەزیری و شەرەفخانی بەدلیسی و شێخ عبیداللە ی نهری و شێخ سەعید و قازی محمد و شێخ مەحمود و مەلا مستەفا بارزانی .

ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەو ئاینە پیرۆزەیە کە ئێمەی موسوڵمانی ڕزگار کرد لە ئاگر پەرستی و ژێردەستەیی بێزەنتیەکان لـە باکوری کوردستان ( تورکیای ئێستا ) وە لەبەردەستی ساسانەکان لە ڕۆژهەڵات کە لە( ئێرانی) ئێستا بوون، وەك باقی گەلانی موسڵمان ئێمەی ڕزگار کرد لەتاریکی و کوفرو ئاگر پەرستی بۆ ڕووناکی و ڕێگەی سەر فیازی و ئازادی و سەربەستی کە بێ گومان ئەو حاڵەتە یەکێکە لە حاڵەتە هەرە گەورەکانی ئیسلام (اللهُ وليُّ الذين آمنوا يُخرجُهم من الظّلماتِ الى النور، والذين كفروا أولياءهُم الطاغوت يُخرجونهم من النور الى الظلمات أولئك أصحابُ النار هم فيها خالدون) البقرة ٢٥٧.

ئایا چ شتێك لەسەر ئەو ئەرزە گەورە ترو پیرۆز ترو ڕاسترە لە ئیسلامێك کە مرۆڤ لە ئاگر پەرستی ڕزگار کا ، ئەو ئاگرەی کە خۆی دایدەگیرسێنی هەرکاتێ پیویستی پێی هەبێ ، هەر خۆی دەیکوژێنتەوە هەر کاتێ پیویستی پێی نەما، ئەو ئاگرەی کە هەزار ساڵ مرۆڤ بیپەرستی ناتوانی بەزەرە سوودی پێ بگەیەنێ ، بەڵکو هەندێ جار گەر لێی غافڵ بوو یاخود بە هەڵە دایگیرساند تەڕو وشکی لێ دەسوتێنی و بەڵکو خۆیشی لەناو دەبات، یاخود بوتێك کەبەدەستی خۆی دروستی دەکا و هەرگیزاو هەرگیز ناتوانێ مێشێك لەخۆی دەرکا چ جای ئەوەی بتوانی ئاواتەکانی مرۆڤ جێبەجێ بکا، وە هەرکاتێ ئەگەر سەگێك میزی پێداکا ناتوانی لەخۆی دەرکا ، بەڵێ هیچ شتێك نییەو نابێ لەسەر ئەو ئەرزە لە ئیسلام ڕاسترو پیرۆز ترو جوانترو پێویستر ،چونکە بەڕاستی ڕزگارکەری مرۆڤە لە هەموو تاوان و نەزانینەکان و گوناه و هەڵەکانی ژیان، هۆی هەرە گەورەو ڕزگارکەری مرۆڤە لەدونیاو قیامەت . لەدونیا ڕزگاری دەکا لە پەرستنی بوت و سەنەم و هەر مەخلوقێکی تر بۆ پەرستنی خوای گەورە ئەو خوایەی کەبەتەنها شایەنی پەرستنە لەبەر ئەوەی خالیقی هەموو ئەرز و ئاسمانەکان و بوونەوەرو گیانلەبەرو مرۆڤە لە نەبوو، ئاینێك ئەوە سروشت وسیفەتی بێ چۆن دەبێتە هۆکاری

دواکەوتن، نەخێر مرۆڤ خۆی هۆکاری دواکەوتنی خۆیەتی بەهەموو کێش و بەرد و تەرازوێك.

ئاینی ئیسلام سەرچاوەی هەر هەموو پێشکەوتنەکانە تا دونیا دەبڕێتەوە ، دەریایەکە ئاوەکەی ڕۆنترین و خاوێنترین ئاوی سەر ئەرزە هەرگیز قوڕاو نابێ و ناشەقێ و هیچ جۆرە میکرۆب و ڤایرۆسێکی دواکەوتن بەخۆی ناگرێ و سەرچاوەی بێ بڕانەوەی هەر هەموو هۆکارەکانی پێشکەوتن و پێشکەوتنخوازی زانیاری و زانستەکانە ، هەرگیز نابێتە تابیع و بەشێك لە هیچ شتێ بەلکو هەرچی لەسەر ئەو زەویە هەیە بەشێکە لەئەو و هەموو پێداویستیەکانی ژیانی مرۆڤ و گەلان بەتەواوی دابین دەکا بەزیادەوە، هەرچەند مرۆڤ بەرەو پێشەوە بڕوا هەرگیز ناتوانی پێشی لێ بگرێ و پێشی بکەوێتەوە، وەهەرچەندە بەرز بێتەوە هەرگیز ناتوانی بگاتە دەیەکی بەرزایی ئیسلام ، مرۆڤ ڕووناکی تەنها لەو ئاینە پیرۆزە دەست دەکەوێ و شتێك نیە و نابێ و نەبووە جێی بگرێتەوە، تاکە بەرنامەیە کە هەموو دونیای لەباوەش گرتیە ، بەلاّم شتێك نییە ئەو لە باوەش بگرێ لەسەر ئەو ئەرزە هەتا ڕۆژی دوایی .

سەرەڕای ئەوانەش هەموو هۆکاری هەرەگەورەی بەختەوەری و سەرفیرازی مرۆڤ لە ڕۆژی دوایی تەنانەت ئەو بەختەوەریەی کە لەدونیا پێی دەبەخشێ ناگاتە زەڕەیەك لەو بەختەوەریەی کە لە ڕۆژی دوایی ( بەئیزنی خوای گەورە ) پێی دەبەخشێ ، وەك خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێ (.... وَنَزَّلنا عَلَيْكَ الكتابَ تبياناً لِكُلِّ شيءٍ وهدىً وَرَحْمَةً وَبُشرى للمُؤمنينَ) النحل ٨٩ . (ما كان حديثاً يُفترى ولكنْ تَصديقَ الّذي بينَ يَدَيهِ وَتَفْصيلَ كلِّ شيءٍ وهُدىً ورحمةً لِقومٍ يؤمنون) يوسف ١١١.

قورئانی پیرۆز کە بناغەی ئاینی ئیسلامە وەنەبێ ئایەتێك یا چەند ئایەتێکی بەڵگەبن لەسەر پێشکەوتنخوازی و ڕاستی ئەو ئایەتە پیرۆزە، وەنەبێ ئایەتێك یا چەند ئایەتێکی دژی ژێر دەستی و جەهل و دواکەوتن و چەوساندنەوەو بەندایەتی بەندە بۆ بەندەبێ بەڵکو هەرلەیەکەم پیتی تا دوا پیتی، هەرلەیەکەم وشەی تا دوا وشەی هەر لەیەکەم ئایەتی تا دوا ئایەتی هەر هەمووی موعجیزەیەو بناغەی بەردی زانیاری و زانست و پێشکەوتن و بەختەوەری و سەربەخۆی و گەلانی موسڵمانە، حەدیسە ڕاستەکانی پێغەمبەری خۆشەویستمانیش چیان لە قورئانی پیرۆز کەمتر نیە، چونکە پێغەمبەری خۆشەویستمان بە ئیزن و فەرمانی خوای گەورە ئەو فەرموودانەی فەرمووە، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: (والنَّجمِ اذا هوى، ماضَلَّ صاحُبكم وما غوى، وما يُنطقُ عن الهوى إن هو إلاّ وحيٌ يوحى) النجم.

کە مادام خوای گەورە شاهیدی بۆ بداو ئاگادارمان کاتەوە کە ئەوەی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرموویەتی هەموو بەئیزنی خواو لەسەر ویستی خوای گەورە فەرموویەتی نەك لەخۆوە؟ وە دەفەرموێ: (هو الذي بعثَ في الأميين رسولاً منهم يتلوا عليهم آياته ويُزَكّيهم ويعلمهمُ الكتاب والحكمة وإن كانوا من قبلُ لفي ضلال مبين) الجمعة ٢. شاهیدی خوای گەورە لەو ئایەتە ڕون و ئاشکرایە.

دیارە دەبێ گەورەترین سەرچاوەی ئاینی ئیسلامی پیرۆز بێ لەدوای قورئانی پیرۆز یاخود بارتەقای قورئانی پیرۆز بێ ، چونکە بەسەدان ئەحکام و ئەمرو نەهی لە قورئانی پیرۆز باس نەکرایە پێغەمبەری خۆشەویستمان (عليه الصلاة والسلام) بەحەدیسە ڕاستەکانی هەمووی دیاری کردیەو ڕۆن کردیتەوە.

که ئیسلام خودی خۆی شاهیده لەسەر پاکی و ڕاستی بەرامبەر کورد ، مێژوو و واقیعش شاهیدن لەسەر ئەو پاکی و ڕاستی یە.

زانیمان و پێویستیشە بزانین کە ئیسلام ڕاست و پاك و پیرۆزە لەبەرامبەر گەلی موسڵمانی کوردو هەموو گەلانی موسڵمان، چونکە تاکە بەرنامەیە کە ڕاستیەکی ڕەهایە ، لەلای خوای گەورە هاتووە، وە تاکە بەرنامەیە کە پێمان دەفەرموێ : ئەمر بە معروف (چاکە) بکەن نەهی لە خراپە (منکر) بکەن (کنتم خيرَ أمة أُخرِجتْ للناس تأمرون بالمعروف وتَنهَونَ عَنِ المنكرِ...) ال عمران (معروف مانای هەموو کارو کردەوەیەك و گوتەیەکی چاك کە فیترەت و سروشتی مرۆڤ بەبێ چەند و چوون بەچاکی دەزانی بابەدەمیش ئینکاری بکا)، چونکە تاکە بەرنامەیە داوای یەکگرتن و تەبایی و برایەتی دەکا (ولا تكونوا كالڎين تفرقوا واختلفوا من بعدما جاوهم البينات) ئَل عمران ١٠٥ ،چونکە تاکە بەرنامەیە خیانەتی بەهەموو شێوەکان حەرام کردیة (إنَ الله لايُحب مَنْ كانَ خواناً أثيماً) النساء (١٠٧) (إنَّ الله لايهدي كيد الخائنين) يوسف (٥٢) (ولاتكن للخائنين خصيماً) النساء (١٠٥).

وە تاکە بەرنامەیە داوامان لێ دەکا کەبەدوای هەواو هەوەسی خۆمان و هیچ کەس نەکەوین ،چونکە سەرچاوەی هەر هەموو بەڵاو موسیبەتەکانی دونیایە: (وَمَنْ أضلُّ ممن آتبع هواهُ بغير هدى مِنَ اللهِ إنَ اللّه لايهدي القوم الظالمين) القصص(٥٠) ،چونکە تاکە بەرنامەیە کە دڵی مرۆڤ ڕووناك دەکاتەوە و لەعەیب وعار پاکی دەکاتەوە ، کە مرۆڤیش ئەوە بەرنامەی بوو هەرگیز ڕیسوانابێ و شکست ناهێنی (سيهديهم ويصلح بالهم ) .

چونکە تاکە بەرنامەیە فێربوونی زانست لەسەر مرۆڤ فەرز دەکا و دەفەرموێ (يرفعُ الله الذين امنوا والذين اوتوا العلمَ درجات) (اقراً بأسم ربك الذي خلق).

یەکەمین بەرنامەیەکەلـە دوای ئیمـان ، کـردەوە چـاکەکانی لەســەر مـرۆڤ فەرز کردیە (والعصر إن الأنسان لفي خُسرٍ إلاّ الـذين آمنـوا وعملـوا الـصالحات وتواصوا بالحق وتواصـوا بالـصبر) ، چـونکە یەکـەمین بەرنامەیـە کـە هـەموو نەخۆشیەکانی دەروونی چارە دەکاو هـەموو غـەم و پەژارەیـەك دەرەوێنێتـەوە (ألا بذكرالله تَطمئن القلوب) الرعد ٢٨ ، (يا أيها الناس قد جاءَكم موعظةٌ من ربكـم وشفاء لما في الصدور وهدىً ورحمة للمؤمنين) يونس٥٧.

دەبا ئەوجا بگەڕێینەوە سەر ئەو بەڵگـە مێـژوو و واقیعانـەی کـە شـاهیدی ڕاستەقینەن لەسەر پاکی و پیرۆزی لەبەرامبەر ئەو دواکەوتنـە کوشـندەیەی کـە لەگیان و لەش و خاکی کورد ئالآوە و وەکو تۆڕ کەوتۆتە ناویەوە . بابزانین هەندێ لەو بەڵگانە کامـانەن:

١- مێژوو بۆمـان دەگێڕێتەوە بەر لە دوو هـەزار و حـەوت سـەد سـاڵ پـێش ئەمڕۆ دەوڵەتێکی کوردی هەبووە بەناوی دەوڵەتی (ماد - میدیا) ئـەو دەوڵەتـە سەدو پەنجا ساڵ حکومڕانی کردیە، تا پێنج سەدو پەنجا ساڵ پێش لەدایك بـوونی (عیسا علیە السلام) لە دواتـر (کـۆڕش) ئیمپراتـۆڕی فارسـی دایـك جولەکـە توانیویەتی ئەو دەوڵەتە کوردیە بڕوخێنی.

لێرەدا ڕاستیەك و پرسیارێك خۆی دەخا بەنێو مێشکمان: ڕاستیەکە ئەوەیـە: ئەو دەوڵەتە بەر لەدایك بوونی (محمد علیە الـصلاة والـسلام) بـەماوەی هــەزار و سەدو شەست و یەك ساڵ ڕووخاوە. پرسیارەکەشمان ئەوەیە: ئەی بۆ لەو مـاوە دوور و درێژەی خۆی زیندوو نەکردیتەوە خۆ چ ئیسلام نـەبوو پـێش لـە زیندووبوونـەوە بگری؟ شایانی باسە ( وەك مێژوو بۆمـان دەگێڕێتەوە ) بـەدەیان گـەل دەوڵـەتیان لەناو چووە و دواتر توانیوەتیان خۆیـان بگرنـەوە و دەوڵـەتیان زینـدوو کەنـەوە و لەجاران بەهێزتر وەك ئیتالیا ، ئەڵمانیا ، پۆڵەندا کە تەنانەت پێنج جار لەسەر

نەخشەی ئەوروپا ڕەش کراوەتەوە کەچی هەر پێنج جار کەوتۆتە خۆیی و خۆی درووست کردیتەوە!!.

٢- وەك لە پێشتر گورتم گەلی کوردی موسوڵمان بەڕوح و گیان قەرزاری ئاینی پیرۆزی ئیسلامە چۆن و لەبەر چی؟

ا ) چۆن دەبێ ئێمە هەمیشە مەمنونی ئەو خوایە گەورە بێ هاوتایە نەبین هەروەها پێغەمبەرە مەزنەکەمان ( علیه الصلاة والسلام ) کەئێمەی ڕزگار وئازاد کرد لە ئاگر پەرستی و بوت پەرستی و هۆشی بەبەر هێنایەنەوە و ژێری گەڕاندەوە نێو کەللەی سەرمان مرۆڤایەتی لە نوێ پێبەخشینەوە بەو ڕزگار کردن و ئازاد کردنە لەکۆت و زنجیری ئاگر پەرستی ؟ ئاخر توخوا مرۆڤی ئاگر پەرست یاخود بوت پەرست چ نرخێکی هەیە؟ چ عەقڵ و زانیاریەکی هەیە؟ کەمادام خۆی بەگەلێك کەمتر بزانێ لە ئاگر یا لە بوت کە بەدەستی خۆی دایگیرساندیە یاخوت دروستی کردیە؟ ئەسڵەن دەبێ هەرچی بوونەوەر و گیانلەبەرە لەسەر ئەو ئەرزە مرۆڤ بپەرستێ چونکە مرۆڤ لە هەموان ژیرتر و زاناتر و بەدەسەلاتترە ، ئەگەر پەرستنی لەدوای خوا پەرستن هەبوایە ئەوسا دەبوایە مرۆڤ داوا لەهەرچی لەژێرە خۆیەوە هەیە داوای پەرستنی خۆی لێ بکا چونکە هەموومان دەزانین ئێمەی مرۆڤ چین و مادونی ئێمە چییە؟ ئایا هیچ کەس هەیە یا هەبووە لەدونیا لە ئاگر ئەمین بێ یا ئەمین بووبێ ؟ ئایا هیچ کەس هەیە یا هەبووە سودی بای یەك زەرە لە بوت پەرستی وەرگرتبێ مەگەر تاغوتەکان نەبێ کە خەڵکیان پێ چەوساندۆتەوە و بەردەوامیان بە تاغوتی و ستەمی خۆیان داوە لە ڕێگەی بوت پەرستی و زەبرو زەنگی لە ئەندازە بەدەریان . پرسیار لەهەر هەموو مرۆڤێکی خاوەن ژیر و یاری ڕاستی دەکەم ، توخوا تۆ کە ژانەسەرێکی کاتی بتگرێ چەند سوپاسی یەکێك دەکەی کە حەبێکی پاراسیتۆلت پێدا و لەو ژانەسەرە ڕزگارت

بکا ؟ ئەی تۆ چۆن دەبێ سوپاسی ئەو خوایە گەورە نەکەی کە لە ڕێگەی ئیسلام لە ژانەسەرێکی دائیمی و سەرلێشێوانێکی ماڵ وێرانکەر ڕزگاری کردی ؟

ب ) وەختە بڵێم هەموو دونیا دەزانێ و دەمان ناسێ ( وەك لە پێشتر گوتم ) بەدرێژایی مێژووی هەزاران ساڵمان خاوەنی هیچ جۆرە شارستانیەك و ژیاری و خوێندەواریەك و پیشە سازیەك نەبووینەو نەناو و نیشتمان دیار بووە و نەزاناو داناو شاعیر و نووسەر و هۆشمەندمان ، نەسەرکردەو سەرۆك و پیاو ماقوڵمان تەنانەت ڕۆژێ لە ڕۆژان نەخۆمان ناسیوەو نەخۆشمان بەکەس ناسیوە ، لەوپەڕی دونیا ئەوروپایی هاتوون لە حاڵ و بارو مێژوو پێناسەیان کۆڵینەوە ، ئەوانیش زۆربەیان چی چاکیان بۆ نەنووسیوین و پێ نەگوتینە ، لەوەش پتر بەچەندان درۆ و بوختانیان پێکردینە ، وەك مامۆستا هەژار موکریانی لە کتێبەکەی (شەرەفنامە) کە تەرجومەی کردیە لەفارسی بۆ کوردی لە پێشەکیەکەی نووسیویەتی بەو مانایە (لەبەر بێ هۆشی و گۆشی خۆمان ، نەمان توانیوە خۆمان لەو درۆ و بوختانانە بپارێزین کە ناحەزانمان بۆیان هەڵبەستینە) ئەوەتا بەئاشکرا بەنەوەی جنۆکەکانیان ناو بردینە و کەسیش نەهاتیە بە ئێمەی کورد بڵێ ئەرێ ناحەزانی کورد ئەو بوهتانە گەورەیە چییە لە ئێمەی دەکەن؟ ئێمە لە کوێ کە ڕۆڵەی ئادەمین و لەگڵ دروست کراوین و جنۆکە لەکوێ کە خوای گەورە لە ئاگرێکی بێ دووکەڵ دروستی کردوونە ، هەروەها دەڵێ: هەندێ لە ناحەز و دووژمنمان ئێمەی کردیە بەنەوەی (خالیدی کوڕی وەلید) و بەعەرەبیان لەقەڵەم داوین و کەسیش لەخۆمان ڕانەپەڕیوە و بەرپەرچی ئەو درۆ زلە بداتەوە ، شایانی وەبیر هێنانەوەیە کە مامۆستا هەژار موکریانی موفەسری قورئانی پیرۆز لەسەر شێوەی (جلالین) دەرچووی قوتابخانەی پێغەمبەرە ( علیه الصلاة والسلام ) نەك دەرچووی زانکۆکانی ئەمریکا و ئەوروپا . سوپاس بۆ خوا کەدەرچووەکانمان لەو زانکۆیانە نەك زۆرینەیان بەرگریان لەکورد نەکردیە و خۆیان لەحاڵ و باری کورد

نەگەیاندیە ، بەڵکو دایك و باوکیشمان لەبیر خۆیان بردیتەوە و تەنها خەریکی دابین کردنی هەواو هەوەس و بەرژەوەندیە کەسایەتیەکانی خۆیانن و زۆرینەیان کوشتەی حەشیشە و هیرۆین و کۆکایین و سێکسن. بەزەرە بیر و هۆشی نیشتمان پەروەریان تێدا نیە و پیاوی زۆر چاکیان بە حاڵە حاڵ قەبول کراوە بە کۆیلە و ئالقە بەگوێی سەهیۆنی و سەلیبی جیهانی .

بەڵی گەلێك کەسنەناس بووین ، بێ سامان و بێ دەوڵەت بووین ، تا ئیسلامی پیرۆز تەشریفی هێناو سوپاس بۆ خوای گەورە هیدایەتی داین و موسوڵمان بووین لە رۆژگاری خەلیفەی دووەمی راشدین (عومەری کوری خەتاب) رەزای خوای لەسەر بێ ، سوپاس بۆ خوا مێژوو ( بە ئیزنی خوا ) لاپەرەیەکی لە سیفری خۆی بۆ تەرخان کردین و رایکێشاینە رێزی گەلانی جیهان . ئەوسا بووین بەخاوەنی مێژوویەکی هەژار و دەست کورت . ئەوسا فێری خوێندن و نووسین بووین و بووین بەخاوەن سەدان سەرکردەو سەرۆکی وەك شێخ عبیداللە ی نەهری وشێخ سەعیدی پیران و شێخ مەحمودی حەفید و قازی محمد و مەلا موستەفا و سمکۆی شکاك ، هەروەها بووین بەخاوەن سەداان زاناو دانا و شاعیر و هۆشمەند و نووسەری وەك أحمدی خانی و حاجی قادری کۆیی و سالم و کوردی و نالی و مەلای جەزیری و مێژوو نووسی وەك (شەرەف خانی بەدلیس) دانەری مێژووی کورد (شەرەف نامە) کە لە ساڵی (١٠٠٥) کۆچی تەواوی کردیە ، وە مامۆستا هەژار موکریانی موفەسیری قورئان و شاعیر و نووسەری کوردی بەناوبانگ کەشەونامەی وەریگێراوەتە سەر کوردی لە فارسیەوە.

تەحەددای هەموو کورد دەکەم بەر لە ئیسلام شاعیرو زانایەکی وەك حاجی قادری کۆییم بۆ پەیدا کەن لەناو کورد کەهەستی بەکەم و کوری و دواکەوتوویی و ریسوایی کورد کردبێ و بەشیعرەکانی وێنەی واقیعی زێدە تاڵ و دوا کەوتوویی دیتبێ و لەنێو چوارچێوەی شیعرەکانی داینابێ و دیاری کردبێ و دەرمانیش بۆ

دیاری کردبێ . ئەوە حاجی قادرە کە هەرچی فێری بووبێ لە ئەخلاق و خواپەرستی و عیلم و زانست و دووربینی هەمووی لەبەرنامەی پاك و پیرۆزی ئیسلام فێر بووە . ئەوە حاجی قادرە کە تاکە کەسە لە سەدەی نۆزدەم ( لەسایەی ئیسلام ) بە هۆش و بیر و زانایی سەد و پەنجا ساڵ پێش ڕۆژگاری خۆی کەوتبۆوەو لەسەر دەمی ئێمە ئەوەی فەرموو بوی ڕویدا :

وا ڕێگەتان دەبەستێ خێلانی جاف و بلباس

گەر مردوون لە گەرمیان مەمنوعە بچنە کوێستان

مەسجید دەبێتە دێرە ناقوس یان موئزن

مەتران دەبێنە قازی موفتی دەبێنە ڕەهبان

هیچ غیرەتێك نەماوە صەد جا بە قورئان

پەیدابێ ئەرمەنستان نامینێ یەك لە کوردان

ئەم قسەیەی کە کردم ناگاتە چەند ساڵی تر

ئەم حاڵەتە دەبینن یەك یەك بەچاوی خۆتان

لەم بەینە ئیتفاقێ پەیداکەن بەمەردی

فەرقی نەبێ شوان و جووتیار و میر و گاوان

دیوانی حاجی قادری کۆیی لێکۆڵینەوەی (سەردار حمید میرخان ، کەریم شارەزا مستەفا ، پیا چوونەوە مامۆستا مەسعود محەمەد ) .

حاجی قادر لە ژێر سایە و سێبەری ئیسلام ئەو دووربینیەی وەدەست کەوتووە و ئەو ڕووداوانەی دیوە و شارەزای واقیع و حاڵ و باری گەلی کورد بووە . ئەوەیە فەزڵ و منەتی ئیسلام لەسەر هەرکەسێ کە ئیمانی پێ بێنێ و بیکا بەبەرنامەی سەراپای ژیانی. ئەگەر ئاینی ئیسلام ئاینی عیلم و زانست و ڕەوشت و بەرزی و مەردایەتی و تێکۆشان نەبوایە هەرگیز پیاوی وەك حاجی قادری دروست نەدەکرد

لەنێو دواکەوتووترین گەلانی سەرزەوی ، ئەوەی کە پێویستە لێرەدا بگوترێ ئەوەیە: هەرهەموو عەلمانیە دەرچووەکانی ئەمریکا و ئەوروپا لە هیچ لایەنێکی مرۆڤایەتی ناگەنە پای حاجی قادری کۆیی و ئەمسالەکانی مەبەستم لەعەلمانیە دەرچووە کوردەکانە بەس ، ئاشکرایە بەهەموو کێشان و پێوانەیەك زەوی چاك و بەپیت ئەگەر تۆی لاوازی پێداکەی بەرهەمەکەی هەر زۆر چاك و پتەو دەبێ .

زۆر بەدڵنیایەوە دەبێ بزانین کە ئاینی ئیسلام لەنێو کورد گەورەترین بۆشایی سیاسی و ئابوری و عەسکەری و ئەدەبی و ڕۆشنبیری بۆمان پڕ کردەوە و ئێمەی هێنا ڕیزی گەلانی جیهان ، چونکە وجودی ئەو بۆشاییانە لەنێو ڕیز و توێژەکانی هەر گەلێ هۆکاری نەمان و پەرت و بلاّو بوونەوە و تواندنەوەن.

ج — هەموو هەستێکی نەتەوایەتی و گەل پەروەریمان لەدوای موسڵمان بوونمان سەری هەڵدایە و بلاّو بۆتەوە لەنێومان و پەرەی سەندووە ، بۆ یەکەم جار ناوی (کوردستان) کە هاتووە لەسەردەمی عەباسیەکان بووە لە لایەن شاعیرێکی کوردی موسڵمان .

د — سەرکردەی هەموو شۆڕشەکانمان لە سەدەی نۆزدە و بیست شێخ و زانار موسڵمان بوون وەك شێخ عبیداللە ی نهری و شێخ سەعیدی پیران و شێخ مەحمودی حەفید و قازی محەمەد مەلا مستەفای بارزان ، هەندێ جار عەلمانیەکان هاتوون و شۆڕشەکەیان تێکدایە و حاڵ و ماڵی کوردیان وێران کردیە کەچی خۆیان بە پێشکەوتن خواز و شۆڕشگێڕ دەزانن ئیسلام و موسڵمانانیش بە کۆنەپەرست دەزانن .

٣ — پیرۆز ترین و گەورەترین و خۆشترین ڕووداو ئەگەر نەڵێم لە هەموو گەردوون ، بەلاّم دەڵێم لەسەر ئەو ئەرزە پیرۆزە هاتنی ئاینی ئیسلامی پیرۆزە کە ژیان لەسەری بە بێ ئەو ئاینە هیچ مانایەکی نامینێ ، ئەگەر ئەرز حەوا بێ ئیسلام نادەمە ، چونکە هۆکاری هەرە گەورەی ڕزگار کردنی مرۆڤە لە

تاریکیەکان ( کەبێ دوایین ) بۆ تاکە ڕۆناکی خوای گەورە کە خودی ئـەو ئاینـە پیرۆزەیە، (الله وليُ الذين آمنوا يُخرجهم من الظلمـات الى النـور والـذين كفـروا أولياءهم الطاغوت يُخرجونهم مـن النـور الى الظلمـات) البقـرة، خـوای گـەورە ڕزگارمان دەکا لە تاریکیەکان بۆ ڕووناکی، بەهۆی چی ؟ بەهۆی ئەو ئاینە پیرۆزە کە ئاینی ئیسلامە کەسەرچاوەی بێ دوایی و هەرەگەورەی ڕێز ، نرخ و شـەرەف و عیززەتە بۆ مرۆڤ ، تاکە هێزە کە توانای وەستان و خۆڕاگری هەبێ لـە بەرامبـەر ئەو بیر و بۆچوونانەی کە لە نرخی مرۆڤ کەم دەکەنەوە و نەژادی دەگەڕێننەوە سەر میکرۆب و مەیمون . (لقد خلقنا الأنسان في أحسن تقويم ثم رددناه أسفلَ سـافلين إلاَ الذينَ آمنوا وعملوا الصالحات فَلَهُم أجرُ غيرُ ممنون) (فما يُكَذِّبك بعدُ بالـدينِ أليس الله بأحكم الحاكمين ) التين ، یا دەفەرموێ: (ولقد كرَّمنا بَني آدمَ وحملناهم في البرِ والبحرِ ورزقناهم من الطيبات وفضلناهم على كثير ممـن خلقْنـا تفـضيلاً) الأسراء ، چۆن گەورە ترین و خۆشترین و پیرۆزترین ڕووداو نەبێ لـە کـاتێ دا کـە خوای گەورە خودی خۆی خەبەرمان دەداتـێ کەلەسـەر جـوانترین شـێوە دروسـتی کردبین، گەورەترین عەقڵی پێبەخشیوین و زۆرترین نیعمەتی بۆ دروست کـردوین، لەکاتێکدا کە مزگێنیمان دەداتێ کە ڕێزی لێ گرتووین و فەزڵی کردووین بەسەر زۆربەی مەخلوقەکانی لەئەرز و لە ئاسمان ، ڕوداوێـك لـە ئـاینی ئیـسلام دەبـێ خۆشتر و پیرۆز تر و گەورەتر چ بـێ کـە خـوای گـەورە خـالیقی مـرۆڤ و هـەموو گەردوون و بوونەوەر خۆی کەرەم کا بۆمان بنێرێ تـا لـە ژیـانی دونیـا ڕەنـج بـە خەسار نەبین و خۆمـان پێ بناسێنێ وە خۆیشمان بە خۆمـان بناسێنێ .

چۆن گەورەترین و خۆشترین و پیرۆزترین ڕوداو نەبێ؟ بـۆ یەکـەمین جـار لـە مێژووی خێر و شەڕی لەیەك جیاکردەوە . ڕاستی و ناڕاستی لەیـەك جیـاکردەوە و مـافی مرۆڤی (بەژن و پیاوەوە) بەتەواوی دیاریکرد ئەو مافەی کەلەگەڵ سروشـت و فیترەتی مرۆڤ دەگونجێ بەڕێژەی سەدا سـەدیش بـەرەو ژوورتـر. بـەڵی بـەهاتنی

ئیسلام مافی مرۆڤ لەسەر ئەو ئەرزە جارِ درا ، خوێنی هەرکەس لە کەسێکی تر حەرام کرا تەنها بەحەقی ئیسلام نەبێ و بەپێی شەرعی خوا نەبێ، ماڵ و ئابڕو و ناموسی هەرکەس لەکەسێکی تر حەرام کرا، ئافرەت لە باوك برا و مام و کوڕەخوشك و کوڕە براو برای شیری مێردی خوشك حەرام کرا. دایك و ئەولادەتی و باوك ئەولادەتی جێگیر کراو مافی دایك و باوك لەدوای پەرستنی خوای گەورەوە جێ گیر کرا، خوشك و برایەتی و خزمایەتی بوو بە بنەڕەتی پەیوەندیە کۆمەلاَیەتیەکان و بنەڕەتی خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی لە نێو ڕەگەزی مرۆڤ و مافی مرۆڤ و سەلامەتی و هەست بەدڵنیایی مرۆڤ لەترس و برسیەتی کرا بە ئەرکی دەوڵەت، دەوڵەت بەرپرسیار کرا لە پاراستن و دابین کردنیان. مافی مرۆڤ بەرامبەر مرۆڤ و بەرامبەر دەوڵەت جارِ درا هەروەها مافی دەوڵەتیش لەسەر مرۆڤ جێ گیرکرا، هەروەها لەپێش هەموویانەوە مافی خوای گەورە جێ گیرکرا. هەروەها هەموو تاوانێك بەپێی توند و تیژی سزای پڕ بەپێستی خۆی بۆ دیاری کرا، جاڕی یەکسانی لەنێوان ڕەگەزەکانی مرۆڤ دراو جیاوازی لەمیانی سپی و ڕەش و سور و عەرەب و عەجەم نەما و

یەکسەر لە کاتی پێویست ئایەتی( إنَّ أكرمكم عند اللهِ أتقاكم) بەکردەوە جێ بەجێ کرا و (سەلمانی فارسی) ڕەزای خوای لێ بێ لەلایەن پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام ) بووە یەکێك لە ئەهلی بەیتی پاکراوەکان .

بەم چەشنە گەلی موسڵمانمان لەسەردەمی خەلیفە (عمری کوڕی خەتاب) موسڵمان بوو بەبێ کوشتار ، لەو کاتەوە تاکۆتایی و ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی عەباسی لە ئاشتی و ئاسایش دا ماوە و ژیانی بەئاسودە بردە سەر ( واتە بۆ ماوەی سەدان ساڵ ) هەر لە ڕۆژی موسڵمان بوونی بە خۆشیی خۆی تا ساڵی (٦٥٦) کۆچی و ساڵی (١٢٨٠ )ی زاینی ، لەو ماوە دوور و درێژەدا کەسێ نەیبیست و نەی دیت کە عەرەب زوڵم و ستەمان لێ بکا و خاکمان داگیر کا،

تەنانەت لەو ماوە دوور و درێـژە خێزانێکـی عـەرەب بەمەبەسـتی داگیرکـردن و خۆهەڵدانەوە بەسەر کورد نەهاتە کوردسـتان خـۆی نیشـتە جـێ کـا، ئیسلام و سەرکردەکانی ئیسلام لەو ماوە دوور و درێـژە خـاڵێکی ڕەشـیان لـە نێـو مێـژوو درووست نەکرد لەبەرامبەر کوردی موسوڵمان . لەو بارەوە گومانتـان نـەبێ کـە ئەگەر هـەر خراپەیـەك و دەسـت درێژیـەکمان بەرامبـەر ئـەنجام درابـا لەلایـەن ئەمەویەکان یا عەباسیەکان ئەوە مێژوو بە زیادەوە بۆی تۆمار دەکردن .

باوەڕیش کەن هیچ ڕوویەکی بەراورد کردن نیـە و نـابێ لـەمیانی ئیـسلامی پیرۆز و هەنگاوە پیرۆزەکانی لەبەرامبەر جاڕدانی مافی مرۆڤ کە یەکـەم جاڕدانـە لە ڕاستی و لە پاکی و لە ئەنجامدانی تا دونیا دەبڕێتەوە لەگەڵ جـاڕدانی مـافی مرۆڤ لە لایەن ڕێکخراوە نێـو دەوڵەتیـەکان ( منظمـة الأمـم المتحـدة ) لـەدوای جەنگی جیهانی دووەم. دەستکەوتی ئێمەی موسڵمانی کورد لـەو جاڕدانـەی ئـەو ڕێکخراوە تەنها پارچە پارچە کردنی کوردستان و شەق و تێهەڵـدان و دەربـەدەری بوو هیچی تر نا ، لەوساوە هەرچی خێرو خۆشی بێ لەخۆمان نەدیوە و ڕۆژێك لـە ڕۆژان لـە نێـو مـاڵی خۆمـان بـە ئاشـتی و ئاسـوودەیی نـەژیاوین ، لەوسـاوە بەملیۆنەها تەن بۆمبا و ناپاڵمان بەسەردا دارێژراوە و کام چەکی کوشندەیە بـە ئێمەی موسڵمانی کـورد تـاقی کراوەتـەوەو پتر لـە سـێیەکی کـورد یـا نیـوەی نیشتمانەکەمان بەدەستی تاغوتەکانی تورك و فـارس و عـەرەبی عـەلمانی داگـیر کراوەو زۆر بە ڕاشـکاویش لەلایـەن ئـەو ڕێکخـراوە دەوڵەتیـە یارمـەتی دراون و پیرۆزباییان لێ کراوە و دەست خۆشیان لێ کـراوە . بەسـەدان هـەزارانمان لـە ژن و پیاو و پیر و پەککەوتەو منداڵ لێ کوژراوەو زیندەبەچاڵ کراوە کەچی مافی مرۆڤی ئەو ڕێکخراوەیە نەك ناڕەزایی خۆی دەرنەبڕیوە ، بەڵکو ئـەو پـەڕی خـۆی لێ بـێ دەنگ کردووە. بەڵام کاتێ ئەو ڕێکخراوەیە لە ڕێکخراوەیەکی نێو دەوڵەتی شۆڕا و بوو بە ڕێکخراوەیەکی ئەمریکی ئەوسـا جـار جـارە ئـەمریکا گـەر بەرژەوەنـدی

ئابووری و لەشکری خۆی تێدا با تا بەرژەوەندیەکەی ئەنجام دەدا بەدەنگ دەهات ، ئەوسا لە جاران پتر لە و تاوانەی کە لە دژمان ئەنجام دەدرا خۆی بێدەنگ دەکرد و هێندەی تر قورِ بەسەرمان دەبوو .

توخوا ئاینەك ئەوە مێـژووی ڕاسـتەقینەبێ بەشـاهیدی نـەك تـەنها مێـژوو نووسـانی موسـڵمان بـەڵکو بەشـاهیدی سـەدان مێـژوو نووسـانی نەسـارا لـە ڕۆژهەلاَت و لە ڕۆژ ئاوا توخوا ئەو ئاینە چۆن دەبێتـە هـۆی دواکـەوتنی کـورد؟ بێگومان دەبێتە هۆی پێشکەوتنی ، بەلاَم بۆ پێش نەکـەوت؟ لـەکات و شـوێنی خۆی وەلاَمی دەدەینەوە بەیارمەتی خوای گەورە .

٤- ئەوەی لە نێو لاپەڕەکانی مێژوو بەڕوونی تۆمار کرایە ئەوەیـە کـە گـەلی عەرەب بەرلەهاتنی پیرۆزی ئیسلام لە دواکەوتوو ترین گەلی دونیا بوون لـە نێـو بیابانەکانی نیمچە دوورگەی عترەب ( شبه الجزیرة العربیة ) ژیانیان لە ژێر زەبـر و زەنگی شەروشۆڕو تالاَن کردنی یەکتر وکیژۆڵـە زینـدە بەچـاڵ کـردن و گیـانی عەشیرەت گەری و بوت پەرستی دەبردە سەر، لە
هەموو لایەکەوە گەمارۆ درابوون بە هۆکارەکانی نەناسراوی و دواکەوتن تەنانـەت ئەو سەدەی بەر لەهاتنی پیرۆزی ئیسلام تێدا دەژیا ناوی نرابوو سەردەمی نەزانی ( العصر الجاهلي ) .

بەلاَم کاتێ خوای گەورە ڕەحمی پێکردن و پێغەمبەر ی ( رحمة للعـالمین ) بـۆ ناردن و موسڵمان بوو ن ئیتر هەر خوا بزانێ و باس ناکرێ کە چ پێشکەوتنێکیان بەدەست هێناو بوون بەخاوەن پیرۆز ترین مێژوو ، بـوون بـەخاوەن شارستانیەت و گەورەترین و پیرۆز ترین و بەهێزترین دەوڵەتی سەردەم ، لـەژێر سـایەی دەوڵـەتی ئیسلام لە ژێر سەرکردایەتی پێغەمبەر ( علیه الصلاة والسلام ) و خەلیفـەکانی راشدین ( رضی الله تعالی عـنهم ) نیمـچە دوورگـەی عـەرەب و هـەموو ئـەو وڵاَتانەی کەلەسەر دەستیان موسڵمان بوون یاخود جزیەیان قبوڵ کرد ئـەو پـەڕی

بەئاشتی و ئاسایش و ئاسوودەیی دەژیان وە ولاتی هەر هەمووان ئاوەدان بــووە بــە ڕووناکی ئیسلام صەحابەکانی پێغەمبەر ( ڕەزای خوایان لێ بێ ) ئەوەتا کاتێ کە سوپای پیرۆزی ئیسلام لەسـەردەمی خەلیفـە( عومـەری کـوری خـەتاب) ) ڕەزای خوای لێ بێ ولاتی شام فتح کرا بە سەرکردایەتی (ئەبو عوبێدەی کوڕی جـەڕاح) گەلی شام موسـڵمان نـەبوون و وەلامـی خـواو پێغەمبـەریان نەدایـەوە ، بـەپێی شەریعەتە ڕاستەکەی خوا (جزیە ) یان لەسەر فەرز کرا و جزیـەی سـالێکیان لێ وەرگیرا ، بەلام کاتی کە ئەبو عوبەیدە ( ڕەزای خـوای لەسـەر بـێ ) نامەیـەکی بەپەلەی بۆ خەلیفە (عومەر ڕەزای خوای لێ بێ) نـارد تێیـدا نووسـیبووی کـەوا سوپای ڕۆم وا بەسەدان هەزار سەرباز خەریکن بەرەو شام بێن ئێمەش لەبەرکەمی سەرباز و تفاقی جەنگ توانای جەنگمان لەگەڵ ئـەو لەشـکرە بـێ ئەنـدازەی ڕۆم نییە ، فەرموو جەنابت چ دەفـەرمووی؟ خەلیفـە عومــەر ڕەزای خـوای لێ بـێ ، یەکسەر نامەی بۆ ناردەوەو ووتی بەخێرایی ولاتی شام بەجێ بهێڵە . لەبەر ئـەوەی ئەو جزیەی کەلەخەڵکی شام وەرگیرابوو جزیەی سالێك بوو کەچی ئـەوان تـەنها چەند هەفتەیەك بوو لەوێ جێگیر بووبـون ئـەبو عوبەیـدە ڕەزای خـوای لێ بـێ ، یەکسەر خەڵکەکەی بانگ کردوو جزیەی دانـەوە ، کـاتێ کـە خەڵکەکـە لێیـان پرسی بۆچی ئەو پارەیەمان بۆ ڕەت دەکەنەوە؟ پێیان گـووتن ئێمـە جزیـەی یـەك ساڵمان لێ وەرگرتن ، بەلام لەبـەر ئـەوەی کـە سـاڵەکە هێـشتا بەسـەر نەچـووە دەکشێینەوە ئەو جزیەیە لە ئێمە حەرامەو دەبێ بیگەڕێننەوە بۆتان ، چونکە ئەو جزیەیەی کە لە ئێوە وەرگیراوە بۆ پاراستنی ئێوەیە واتە دەکرێ بەخەرجی لە پێناو ئەو هۆکارانەی کە ئێوە دەپارێزی نەك بۆ باخەڵی خۆمان ، ئێـستا کـە بـەجێتان دەهێڵین بەر لە تەواو بوونی ساڵەکە خوای گەورە ئەمرمان پێدەکا کە بۆتـان ڕەت کەینەوە. خەڵکەکە بەو هەنگاوە پیرۆزەی ئیسلام یەکجار شـادمان بـوون، ئەوسـا تێگەیشتن کە ئیـسلام هــەر هــەموو عەدالـەت و داد پەروەریـە یەکـسەر هــەر

هەموویان موسڵمان بوون بەبێ ئەوەی یەك تنۆکە خوێن لەچ لایەك برژێ . ئەوەیە بەرنامەی پیرۆزی ئیسلام، ئەوەیە ئیمانی ڕاستەقینە بەو ئاینە پاکە ، ئەوەیە مێژووی زێدە سپی و پاك و خاوێنی ئیسلام و موسڵمانانی ڕاستەقینە . ئەگەر زەحمەت نییە هەندێ لەو شەڕو جەنگانە بخوێنەوە کە کافران و خاچ پەرستان بەدرێژایی مێژوو بەرپایان کردووە و بزانن لەشکرەکانیان چ هەڵس و کەوتێکیان هەبووە لەگەڵ خەڵکانی بێ چەك و ماڵ و منداڵ و پیر و پەککەوتە دوای تەسلیم بوون و کۆتایی هاتنی جەنگ .

توخوا ئاینێك ئەوە سروشت و سیفەتی بێ چۆن دەبێ مرۆڤ هێندە بێ ئینساف بێ ، بەکوێرەوەری و دواکەوتنی گەلی کوردی گرێ دا و هەموو دواکەوتنەکانمان بداتە پاڵ ئەو ئاینە .

( جزیە ) ئەو هێندە پارەیە کە لە زەکات کەمترە لەشکری ئیسلام لەسەر فەرمانی خوای گەورە فەرزی دەکرد لەسەر ئەو وڵاتەی کە فەتح دەکرا و خەڵکی ئەو وڵاتە موسڵمان نەدەبوون و لەسەر ئاینی خۆیان دەمانەوە، ئەو جزیە ساڵانە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرا و دەکرا بەخەرجی بۆ دابین کردنی پێداویستیەکانی سوپای ئیسلام لەو وڵاتە ، قەبوڵ کردنی جزیە لەلایەن وڵاتی فەتح کراو نیشانەی بێ هێز و تەسلیم بوونی ئەو وڵاتەیە و ڕازی بوونە بە فەتحی ئیسلام و سوپای ئیسلامە لە لایەن وڵاتی فەتح کراو کە چیتر دوژمنایەتی ئیسلام و سوپای ئیسلام ناکەن و بەفەرز کردنی جزیە لەسەریان ڕازین ، (وقاتلوا الذين لايؤمنون بالله واليوم الآخر ولايحرمون ما حرّم الله ولا يدينون دينَ الحق حتى يُعطوا الجزية عن يدٍ وهم صاغرون) التوبة٢٩ .

ئەوەی کە لە مێژوو لە هەموو شتێك گرنگترو جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە یەك تاکەکەس بەبێ هیچ هێزێکی ماددی و لە هەموو کەس هەژارترو دەستکورتر توانی گەلێك ڕزگار کا لە تاریکیەکانی ژیان بۆ ڕووناکترین و

بەرزترین پایەو پلەی ژیان لە ڕێگەی ئەو قورئانە گەورەو پیرۆزە کە ئەویش سەروەری پێغەمبەران و گەورەی هەموو ڕۆڵەکانی ئادەم (محمد) بوو ( علیه الصلاة والسلام ) کێ بەر لە ئەو یاخود لەدوای ئەو توانیویەتی بەهەزاریەکی ئەو شاکارە پیرۆزە هەستێ؟ لەسەرەتا توانی گەلێك ئازاد کا لەکۆت و زنجیرەکانی جەهل و نەفامی و دواکەوتن کە هەزاران ساڵ بوو خەریکی بوت پەرستی بوو خۆی شەتەك دابوو بەتاریکترین بەرنامەی جەهالەت و دواکەوتن دوابەدوای ئەوانیش چەندان گەلانی دیکەی سەرزەوی. لەوەتەی خوای گەورە زەوی دروست کردیە و بەمرۆڤ ئاوەدانی کردیتەوە کاری وا راست و سەر سوڕهێنەر کەس نەیدیوەو نەیبیستوە (محمد) (علیه الصلاة والسلام ) تاکە مرۆڤە کە بەو کارە گەورەیە هەستابی لەڕێگەی ئیسلامی پیرۆز بەیارمەتی خوا . بێگومان ئەوکارە گەورەو سەرسوڕهێنەرەی(محمد) ( علیه الصلاة والسلام ) گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستی و پیرۆزی پێشکەوتنی ئاینی ئیسلام .

٤ – بێ ئاگایان و بێ خەبەران لەناحەزانی ئیسلام و موسڵمانان دەڵێن : عەرەب بۆیە کە لەڕێگەی ئاینی ئیسلام کە ( رحمة للعالمین) و ( وما أرسلناك إلا رحمةً للعالمین ) پێشکەوتن و چەندان دەوڵەتی ئیسلامیان دامەزراند ، وەك دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسی و ئەمەوی لە ئەندەلوس ، چونکە ئاینەکە هی خۆیان بوو تەنها بۆ ئەوان هاتبوو هەربۆ ئەوان دەست دەداو خێرو بێری پێوەبوو!! بەڕاستی بۆچونێکی زێدە هەڵەیە . بۆچونێکە لە مرۆڤی نەزان و ناشارەزا دەوەشێتەوە . دیارە ئەو کەسانەی ئەو بیرو بۆچونانەیان هەیە زەرەیەك شارەزای مێژوو نین ئەگەر شارەزا بان دەوڵەتی یاخود ئیمپراتۆریەتی عوسمانییان دەدیت کە یەکێك بوو لە هەرە ئیمپراتۆریەتەکانی دونیاو مێژوو نزیکەی شەش سەد ساڵ حوکمی کرد لەولاتی (ئاسیای بچوك) واتا (تورکیای ئێستا ) .

ئەوەی کە پێویستە بگوترێ لێرەدا دەرحەق بەو ئیمپراتۆریەتە ئەوەیە کە بەردی بناغەی لەسەر بەرنامەی پیرۆزی ئیسلام دامەزرابوو لەگەڵ ئەوەش کە عەرەب نەبوون و تورك بوون ، بەڵام بەحەقیقەت موسڵمان بوون .

ئەو تورکانە پاشماوەی دەوڵەتێکی تێکشکاو بوون( وەك مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە ) کەناوی دەوڵەتی سەلجوقی بوو کەبەدەستی فارسەکان لەناو چوون لەناوچەی (خۆزستان) . هۆزێکیان لەو لەناو چوونە خۆیان دەرباز کردوو هەلاتن و خۆیان لە تورکیای ئێستا گرتەوەو سەرۆکەکەیان ناوی (عوسمانی کوڕی ئەرتوغۆڵ) بوو کە پیاوێکی یەکجار خوا ناس و سیاسی و زانابوو، دەوڵەتی عوسمانی بەنێوی ئەو ناو نرا ، ئەو کەڵە پیاوە تامرد لەسەر بەرنامە پیرۆزەکەی خوا کاری کردو هەمیشە ئامۆژگاری کوڕەکەی و بنەماڵەکەی دەکرد کە نەکەن دەست لەئاینی خوا بەربدەن ئەگەرنا لەناو دەچن هەروەك چۆن لە ڕابردوو تێکشکان و دەربەدەر بوون ، هێندەی نەبرد کە رووبەری ئیمپراتۆریەتەکەیان گەیشتە حەوت ملیۆن میل دووجاو هەموو ڕۆژهەلاتی ئیسلامیان کەوتە بەردەست و لەڕۆژئاواش سوپایان گەیشتە (ڤیێنا) پایتەختی نەمساو سنورەکانی ولاتی (غال) ( فەرەنسای ئەمڕۆ) لەو ڕاستیە گەورەو مێژووییە ئێمەی کورد دەبێ چی لێ هەلگرینەوە ؟

١ – ئاینی ئیسلام تەنها ئاینی عەرەب نییەو تەنها عەرەب سوودی لێ وەرنەگرتیەو وەرناگرێ ، بەلکو خوای گەورە دەفەرموێ: (وما أرسلنا إلا كافةً للناس بشيراً ونذيراً... ).، یادەفەرموێ (وما أرسلناك إلا رحمةً للعالمين) الأنبياء ، خوای گەورە وەك لەپێشتر ووتم کێ موسڵمانێکی بەتەقوا تربێ ئەوی فەزڵ دەکا بەسەر عەرەبێکی قورەیشی یا هاشمی کەم تەقوا وەك دەفەرموێ: (إن أكرمكم عند الله أتقاكم إنّ الله عليم خبير) الحجرات(١٣) .

۲ – ئاینی ئیسلام هۆکاری هەرە گەورەی هێزو دروستکردنی دەوڵەتە ، ئەوەتا ئەو ئیمپراتۆریەتە گەورەی عوسمانی بەردی بناغەی لەسەر ئەو ئاینە پیرۆزە دامەزرا ، ئایا ئەو کەسانەی کە ئاینی ئیسلام بە هۆکاری دواکەوتن دەناسێنن بەخەڵك یا وا دەزانن کە ئیسلام ماکی دواکەوتنە ئایا خۆیان لە دامەزرێنەری ئەو ئیمپراتۆریەتە بەزاناتر دادەنێن؟ یاخود دەیانەوێ عەیب و عارو کەم و کوڕی خۆیان لە ڕێگەی ئەو درۆ زلە بشارنەوە ؟ ئاخۆ ئەو ئاینە دەبێ چ ئاینێك بێ چ بەرنامەیەکی پڕ ئاسۆ و ڕاست و پیرۆز بێ کە بتوانی بەویستی خوا هۆزێکی شکاوی دوورە ولاتی دەربەدەر لە ولاتێکی بێگانە بکا بەگەورەترین ئیمپراتۆریەتی سەرزەوی لە ڕۆژهەلات؟ ئاشکراو ڕوونە گەلی بەزیوو دەربەدەرو هەلات و ڕوو لە هەر ولاتێ کا دەست بەکلاوی خۆیەوە دەگری با نەییات و هەموو سوك و سەر شۆڕیەك لەو ولاتە قبوڵ دەکا حەوانەوەی پێداوە چ جای ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە دەوڵەت و حکومەتی ئەو ولاتە تێك داو خۆی جێی بگرێتەوە؟

ئەوانەی کە بیرو بۆچونیان وایە کە ئەو تورکانە خۆیان خاوەن غیرەت و زیرەکی و ئازایی و فرت و فێڵ بوون ئایا بۆ گەلی ئێمە لە ولاتی خۆمان بەبێ دەربەدەری و پەرتە بوون وەك ئەو تورکانە خاوەن غیرەت و زانایی و ئازایی نەبووین دەوڵەت دروست کەین؟ لەوانەیە هەندێ کەس پرسیار کەن و بلێن ئەی ئەو تورکانە خۆ لە ولاتی خۆشیان هەر موسڵمان بوون ئەی بۆ تێشکان و دەربەدەر بوون؟ لە وەلاما دەڵێین کاکی خۆم کە زۆر هات قەوارە بەتاڵە ، لەشکری فارسان چەند جار بەقەد لەشکری ئەوان بوون . ئیسلامیش ڕوو لە موسڵمانان دەکاو پێیان دەڵێ ئەگەر سوپاکەتان نیوەی سوپای دوژمنانی کافر بوو ئەوە دەبێ شەڕ بکەن ئەگەر ئەوان چەند جاران لە ئێوە زیاتر بوون ئەوا پاشەکشەیان لەبەر بکەن وەك چۆن (ئەبو عوبێدەی کوڕی جەڕاح) لەولاتی شام لەبەر سوپای ڕۆمەکان پاشەکشەی کرد بەر لەوەی ئەو سوپای ڕۆمان بەرێکەوی بەرەو شام و هێرشی

خۆی دەست پێبکا ، هەروەها لەجەنگی (تبوك) دیسانەوە سوپای ئیسلام بە قیادەی (خالیدی کوڕی وەلید) ڕەزای خوای لەسەر بێ لەبەرامبەر سوپا چەند سەد هەزاریەکەی ڕۆم پاشەکشەی کرد ، چونکە ئەوان ڕەزای خوایان لێ بێ تەنها سێ هەزار صەحابە بوون !!.

شتێکی سەیر نییە ، بەڵکو عەیبێکی گەورە نییە بۆ ئێمەی کورد کە واین هەزاران ساڵە لە کوردستانی خۆمانین لەباشوری تورکیا کەچی نەمان توانی دەوڵەتێکی کوردی پێکەوە نێین. لەکاتێکدا بێگانە ڕۆمەکان لە ڕۆژئاوا لە (ئیتالیای ئێستا ) بەر لەدایك بوونی (عیسی علیه السلام ) هاتنە ئەو وڵاتە و دەوڵەتی ڕۆمی ڕۆژهەلاتیان لێ دامەزراند کە درێژەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم بوو لە ڕۆژ ئاوا بۆ ماوەی سەدان ساڵ ، لەدوای هەندێش تورکە تێهەڵدراوەکانی سەلجوقی هاتن جێگەیان گرتەوە لە ساڵی (٦٦٠ کۆچی) کەچی ئێمە جولەمان نەکرد تاکو ئەوڕۆش لەگەڵ بێ ئەوسا بیانگەی تر دەکەینە نانی جۆ، هەموو عەیب و عار و کەم و کوڕی خۆمان بەمل ئاینی ڕاست و پیرۆز و نەمر دا ساغ دەکەینەوە .

دیسانەوە لێرەدا پرسیارێکی دیکە دێتە کایەوە: ئەگەر ئیسلام هۆکاری هەرە گەورەی دروست کردنی دەوڵەتە ، باشە خۆ چ ئیسلام نەبوو، کەچی بەر لە هاتنی ئاینی ئیسلام چەندان ئیمپراتۆریەتی زل هەبوون وەك ئیمپراتۆریەتی فارسی و چینی و ئەفریقی و ڕۆمانی و جەرمانی ئەی ئەو ئیمپراتۆریەتانە لەسەر چ بەرنامەیەك دامەزرابوون؟ وەلامی ئەو پرسیارە هێندەی دیکە ئێمەی کورد عەیب دار دەکا، لە وەلاما دەڵێین هەموو بەرنامەیەکی سیاسی و ئاینی بۆی هەیە دەوڵەتی لەسەر دامەزرێ ئەگەر قادەکانی ئەو جۆرە سەرکردانەبن کە بتوانن دەوڵەت دروست بکەن، لێرەدا بۆمان بەدیار دەکەوێ کە ئێمەی کورد بە درێژایی

مێژوو نە خاوەنی سەرۆك و گەورەی بەتوانا بووینە نەخاوەن بەرنامەیەکی سیاسی و ئاینی دارێژراو !!

لێرەدا زۆر کەس هەنە دەڵێن کاکە ئەگەر گەل خاوەنی سەرۆك و سەرکردەیەکی خاوەن بلیمەت و دڵسۆز و دووربین و نازانم چی بێ ؟ بەرنامە چیە ، هەبێ یان نەبێ ئەو دروستی دەکا ، لێرەدا دیسانەوە لەسەر خۆمانی ئیسپات دەکەین کە ئێمە لە دێر زەمانەوە خاوەنی ئەو جۆرە سەرۆك و سەرکردەیە نەبووینە!!.

بەگوێرەی ئەو ڕاستیە زلەی کە لە دامەزرانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئەو ئیمپراتۆریەتی کە نزیکەی شەش سەد ساڵ حوکمی کرد بەناوی ئیسلام کە ئاینی ئیسلام جگە لەوەی ئاینی هەموو مرۆڤ و گەلێکە نەك هۆی دواکەوتن نییە بەڵکو گەورەترین هۆیە بۆ بنیات نان و دامەزراندنی دەوڵەت.

تکایە لەگەڵم پشوو درێژ بە تا چەندان ڕاستی دیکەش بۆ ڕوون دەکەمەوە کە بەڵگەی چەقیون لەسەر پاکی ئیسلام لە بەرامبەر نەبوونی دەوڵەتێکی کوردی .

## ڕاستیەك پێویستە ڕوون بكرێتەوە

بەر لەوەی خاڵێكی تر دەست پێبكەم زۆر بە پێویستی دەزانم كـە هەڵەیـەكی بەرەودار هەیە لەنێو كـورد بەتایبـەتی لـەنێو لاوەكانمـان ئـەو هەڵەیـە بەرپـەرچ دەدەمەوەو ڕاستی كەمەوە ، ئەمڕۆ زۆرن ئەوانەی كە دەڵێن ئاینی ئیسلام چونكە بەعەرەبی هاتووە ئیمانی پێ ناهێنین ئەگەر بەزمانی خۆمان بـا قەیـدی نـەبوو!! سەیری چەند بیرو رایەكی ناڕاست و نامەنتیقی و نەزانانەیـە، هـەرگیز نەدەبایـە قسەی وا لە خەڵكێكی ڕۆشنبیر بووەشێتەوە ، بـەلاّم مـرۆڤ گـەر بـەدوا هەللاّیـە كەوت هەموو هەڵەیەك دەكا. لێرەدا لەبەر پەرچ دانـەوە و پـووچ كردنـەوەی ئـەو بۆچوونە دەڵێین:

أ – ئایا ئەگەر ئەو ئاینە جیهانیەو ڕەحمەتەن لیلعالەمینە بەكوردی با ئایـا لەنێو عەرەبانیش هەمان گێل و وێڵ نەدەبوون بڵێن: واللە ئەگـەر ئـەو ئاینـە بـە زووبانی عەرەبی با ئێمەش لەوانەیە ئیمانمان پێ هێنابا واتا هـەمان هەڵـەی لاوە كوردەكانی ئێمە دووبارە كەنەوە .

ب – بۆچی شەرمت بە فێربوونی گـۆرانی فارسـی و تـوركی و ئینگلیـزی و فەرەنـــسی نییـــە ســـاڵ دوانـــزەی مـــانگ خـــەریكی فێربـــوون و لەبـــەر كردنیانی و شانازی پێوەدەكەی هەرهەمووی بەدڕەوشتی و توڕەهاتیە ، بۆ شەرمت بەئاینی ئیسلامی پیرۆزە كە هەمووی زانایی و دانایی و ئازایی و ڕەوشت بەرزی و جوان مەردیە . فارس و تورك و ئینگلیز و فەرەنسا لە چ كاتێك لەعەرەب چاكترن و زمانەكەیان لە زمانی عەرەبی پاڵاوترو هاسانترو خۆشترە؟ بـۆ زمـانی ئەوانـەت پێ لە زمانی عەرەبی چاكترە ؟ چونكە هەر هەموو شۆڕشەكانی كورد بە درێژایی مێژوو بەیارمەتی و چەكی كوشـندەی ئـەوان كوژاندراوەتـەوە !!! لەكاتێكـدا زۆر لواوە ( امكان ) زمـانی عـەرەبی فێربی بە سووك و هاسـانی لەبـەر ئـەوەی هـەم

هاسانتره لەو زمانانه وه هەمیشه لەگەڵیان دەژین وا ماوەی هەزارو چوار سەد ساڵه ؟

ج – دەیان هەزار زاناو دانای کورد تەنها بەزمانی عەرەبیان خوێندووه و لەرووی ئیمانەوه بە ئیسلام پێشی زۆر لە زانایانی موسڵمانی عەرەبی کەوتوونەتەوه و بەدڵ و بەگیان بەرگریان له ئیسلام کردیەو زۆرجارانیش لەزانینی زمان و رێزمان صرفی عەرەبی گەلێ له عەرەبەکان زیرەکتر بووینه وەك ( مەلا عەبدالله بیتوشی )دانەری کیتابی (صرف العناية في كشف الكفاية، ١٩٣٢) .

د – ئەی بۆ دەبێ قووتابیەکی کورد که له ئەمریکا یا لەبەریتانیا دەخوێنی بۆ وەدەست هێنانی ماجستەر یا دکتۆرا و دێتەوه ولأت بالأی له لاتان بەقەد بالأی قەندیل بەرزتره ئەوه چیه فێری زمانی ئینگلیزی بووەو بەو زمانه دەدوێ تۆش ئاوته به پایەو پلەی ئەو بگەی و یا خۆزیا هەڵدەهێنی که تۆش لەو زانکۆیانه قووتابی بای ، لەو حاڵەته بۆ ناڵێی والله من زانیاری ئەورووپاو ئەمریکا فێرنابم و نامەوێ فێری بم چونکه ئینگلیزیه ئەگەر کوردی با فێری دەبووم و هەوڵم بۆ دەدا؟ ئەو ئەمریکا و ئینگلیزەی که بەشەش دەقیقه شۆڕشی ئەیلولی کوژاندەوه له ئازاری ساڵی ( ١٩٧٥ ) یا ئەو ئەمریکا ئینگلیزەی بەهەموو جۆره چەکێك یارمەتی صدام حوسێنی دا که کورد لەناو بباو بەدەیان هەزارانی لێ بکوژێ ؟ یا ئەو ئینگلیزەی که هەموو هێزو توانای خۆی بەکار هێنا بۆ کوژاندنەوەی ئەو شۆڕشەی شێخ مەحمودی حەفید له ساڵی ١٩٣٣ .

هـ - کێ هەتا ئێستا زمانی کردیته بەربەست بۆ بلأو بوونەوەی ئایین ، خۆ ئاینی نەسارا چ بەزمانەکانی ئەورووپا نەهاتبووه خوار کەچی هەموو ئەورووپا چوونەسەر ئەو ئاینه کەچی تایبەتیش بوو به جوولەکەکان ، بۆ یەکێك نەیگووت من نابمه خاچ پەرست چونکه لەزمانی من دووره ! شایانی باسه ئاینی نەسارا هەزاران کیلۆمەتر له ئەورووپا دووره کەچی ئێمه لەگەڵ عەرەب شان بە شانین هەروەها نەسارای ئەمریکاو ئەورووپا بە چەندان جار سوورترن لەسەر خاچ

پەرستی بە بەراورد لەگەڵ خاچ پەرستانی وڵاتانی ئیسلام جەنگە صەلیبیەکان (خاجیەکان ) شاهیدن لەسەر ئەو ڕاستیە مێژوویە.

و — چۆن دەبێ مرۆڤ هێندە نەزان بێ و ببێ بەدوژمنی ڕاستی ، ئەوە چیە بەزمانی ئەو نەنوسراوەتەوە؟ ئایا هەمان دوژمنایەتی لە ڕۆڵەی گەلانی تر قەبوڵ دەکا ئەگەر ڕاستیەکان بەزمانی ئەو نوسراوبنەوە؟ لە قەدیمەوە گووتیانە مرۆڤ چەند زمان بزانێ بەوەندە کەسە حیسابە ، من واناڵێم مرۆڤێك هەر یەك مرۆڤەو نابێتە دوو سێ ، چونکە ئەگەر سەد زمانیش بزانی بە بیرو باوەڕو بۆچوون و هەڵس و کەوتی ناگۆڕێ هەروەك خۆی دەمێنێتەوە بەڵام دەڵێم مرۆڤ هەرچەندە زمانان زۆر بزانی هێندە شارەزایی ژیان زیاد دەکاو زیاتر تێدەگاو شارەزایی بەمێژوو و کەلچەری ( ثقافة) و سروشت و سیفاتی خاوەن زمانەکان زیاد دەکا .

٦ — شەشەمین بەڵگەی مێژوویی لەسەر پاك و خاوێنی و پیرۆزی ئاینی ناوداری ئیسلام و پارێزراو لە لایەن خوای گەورە ( جل جلالە ) تا کۆتایی زەوی لەبەرامبەر کوردو نەبوونی حکومەتێکی کوردی سەربەخۆ .

لەو بەڵگەیەماندا دەڵێین یەك لە نیشانەو بەڵگە هەرە گەورەکانی پیرۆزی و باڵای و بەردەوامی ئەو ئاینە پیرۆزە (بەڕێز و خواناس و موجاهیدی گەورەی ئیسلام و کورد ) (صلاح الدین) ی ئەیوبیە سوپاس بۆ خوای گەورە کە ئیسلام پیاوی ئاوا گەورەو خواناس دروست دەکا ، کە بە ئیزنی خوا ، لە هەموو دونیا دەنگی داوەتەوەو چرای پیرۆزی لە ئاسمانی خوا هەتا هەتایە نەکوژێتەوە لەگەڵ ئەوەش کە زۆرترین دوژمنانی خوا دوژمنایەتی دەکەن و بەهەموو هێزو توانایانەوە بەڵام تازە (صلاح الدین) جێی خۆی کردیتەوە لە نێو دڵی هەموو مرۆڤێکی دونیا بە کافرو موسڵمانەوە تەنانەت کافرەکان گەلێ لە موسڵمانەکانە باسی قارەمانەتی و تەقواو جوامێری و ئازایەتی و زانایی ئەو کەڵەپیاوە دەکەن بەدرێژایی ژیانی وە هەمیشە سەریان سوڕماوە لە ڕەحم و بەزەیی و دڵ نەرمی ئەو پیاوە بەڕێزە لەبەرامبەر هەزاران بەدیل گیراوە خاچ پەرستەکان لە سەدەی

شەشەمی کۆچی ، چەند سەیرو جێگەی سەرسوڕمانی هەموو جیهانە کە لە توولی لاوی ئەو پیاوە لەژێر سێبەری بەرنامە پیرۆزەکەی ئیسلام نـاوو ناوبـانگی دەستی بەسەر هەموو دونیا داگرت تا ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی کرد لەتەمەنی پەنجاو چوار ساڵی ، خوای گەورە لێی خۆش بێ هەزاران ڕەحمەت لە گیانی پاکی . ئایا لەمێژووی پیرۆزی (صلاح الدين) چ پەند و دەرسێك وەردەگرین: بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە بەتەنها ئاینی ئیسلامە کەڵەپیاوی ئاوای لەژێر سێبەری بەردەوامی دروست دەبی ، لەگەڵ ئەوەشا ڕۆڵەی گەلێکە لەهەموو گەلانی دونیا بێ ناوبانگ ترو دواکەوتووترو نەناسراو ترە بۆمان بەدیار دەکەوێ کە هەرکەسێ موسڵمانێکی پاك و پیرۆز بوو ئەوجا ڕۆڵەی هەر گەلێ بێ توانای هەیە ( بە ئیزنی خوا ) کە گەلانی هەموو دونیا لە ژێر یەك ئالاّ ( ئالای ئیسلام ) کۆکاتەوە و بجەنگێ لەبەرامبەر گەورەترین هێزەکانی کوفرو ئیلحاد وەك (صلاح الدين ). بۆمان دیار دەکەوێ کە ئاینی ئیسلام تایبەت نیە بەعەرەب بەڵکو (فضلُ الله يؤتيه من يشاء والله واسعُ عليم) المائدة(٥٤) فەزڵی خوای گەورەیە لەسەر ئەرز کێ ی بوێ پێی دەبەخشێ وەك هەموومان دەزانین بەعەرەبی بەخشی بەکورد و تورك و فارسی و ئوردیش و غەیری گەلانی دیکەشی بەخشی .

صلاح الدين تاکە سەرکردەیە لەسەردەمی خۆی بەهۆی ئەوەی کە لە ژێر سێبەری کیتاب و سوننەت گەورە ببوو ناوی دەرکردبوو بەسەرکردەیەکی ئاشتی پەروەرو خواناس و بەزەیی و دڵ نەرم لەبەرامبەر دوژمنانی لەگەڵ ئەوەش بەدەسەلات ترین و بەهێزترینی قیادەی سەردەم بوو ، کەچی پاشاو سەرکردەکانی کوفرو ئیلحاد لەبەناوبانگترین خوێن ڕێژو ستەم کارو زۆرداری جیهانن . بۆ؟ ئەوەیە سیفەت و سروشتی بەرنامەی خوا هەرکەس لەژێر سایەی پێ بگا پیاوی وەك صلاح الدين و لەویش چاکتری لێ دەردەچێ وە بەپێچەوانەوە هەرکەس لەژێر سایەی کوفور ئیلحاد پێ بگا و دەسەلات پەیداکا زۆردار و خوێن ڕێژو تاوانبار دەبێت وەك هەموو تاغوتەکانی دونیا لە ئێستاو ڕابردوو داهاتوو.

## بیرو ڕای عەلمانیە کوردەکان لە بەرامبەر ( صلاح الدین )

زۆربەی هەرەزۆری عەلمانیەکانمان نەك بەسوکی و بێ نرخی سەیری صلاح الدین دەکەن و هیچ حیسابێکی لە ویژدانی مرۆڤایەتی بۆ ناکەن ، بەلکو هەزاران جوێنی ناشیرینیشی ئاراستەدەکەن . بۆ؟ گەر لێیان بپرسی برایان بۆچی وا بەبێ ویژدانانە کەوتوونەتە گیانی پاکی ئەو کەلەپیاوە موسڵمانە کوردە، لە وەلاما دەڵێن : چونکە لەسەردەمی خۆی کوردایەتی نەکردیەو هێزو دەسەلاتی خۆی بەکار نەهێناوە بۆ دروستکردنی
دەوڵەتێکی کوردی بەنەزانی و بێ شارەزایی لەمێژوو لە ژیانی صلاح الدین بەربوونەتە گیانی ئەو خواناسە بەناو بانگەی کورد .

ئێستا لەو چرکەیەی کە من ئەو وشانە لەبارەی صلاح الدین دەنووسم بەدەیان هەزار لەو عەلمانیانە وا لەچایخانەو قومارخانەکان و مەیخانەکان کەوتوونە خەریکی دۆمینەو تاوڵەو پۆکەرو خواردنەوەن و کورد گوتەنی ئاگایان لە عەمری دونیا نیە و ماڵ و منالەکانیان بەرەڵای سەر دونیا کردیەو هیچی چاکیان فێر ناکەن زۆریشی لەوانە لەدام و دەسگاکانی میری کاربەدەستن و ئیش و کاری خەڵکی کوردەواریان لەژێر دەستاو بەزەبری چەشە خۆری و بەرتیل وەرگرتن نەبێ کاری خەڵك ئەنجام نادەن و گیرفان پڕکردن بەماڵی دەوڵەت و خەڵك ئاوات و ئامانجی هەرە گەورەیانە و کارو کاسبیانە .

لە ڕاستیدا کوردێك دەبێ داوای دەوڵەتێکی کوردی بکا کەخۆی سەربازێکی دڵسۆزی ڕەوشت پاکی ئەو داوایەبێ و بەدڵ و بەگیان بۆ وەدیهێنانی ئەو مەبەستە پیرۆزە هەوڵدا . ئەی ئەگەر کوردێك وانەبوو مافی ئەوەی هەیە ئەو داوا گەورەو پڕ کێشەیە بکا؟ نەخێر ئەو مافەی نییەو نابێ نەخۆی و نەهیچ کەسیش ئەو مافەی پێبدا وەك ئەو عەلمانیە کوردانە کە لە کوردستانی باشوورن چونکە ئەگەر نەڵێم خائینن ناشڵێم نیشتمان پەروەرن لەبەر ئەوەی یەکێك درێژی ژیانی خۆی لەپشت گوێخستنی ماڵ و منال و ژنی بباتە سەرو لەچایخانە بۆگەنەکانی

کوردستان و مەیخانەو قومارخانەکانی باتەسەر چۆن دەتوانی مافی کوردایەتی بەخۆی بداو چۆن لێی دەوەشێتەوە کوردایەتی بکا کە مادام وەفای بەرامبەر جەرگی خۆی نەبێت چۆن بەرامبەر بێگانانی دەبێ، یاخود فەرمانبەرێك بێ لەدام و دەسگایەکی میری بەبەرتیل خۆی دەوڵەمەند کا یابە دزینی ماڵی دەوڵەت گیرفانی پڕکا هەرگیز ئەو مافە نابێ بەخۆی دا کە داوا لە صلاح الدین و یا غەیری صلاح الدین بکا کە دەبوایە حکومەتێکی کوردیان بۆ دروست کردابا چونکە ئەو جۆرە کەسانە هەرگیز غەمی کوردیان لەبەر نییەو هەموو دەم ئامادەن بەچەند پولێك خۆیان بفرۆشن یا شەرەف و ئابرویان بەدەستەوە بدەن .

ئەدی بابزانین بۆ هێند هێرشی ناڕەوای خۆیان دەبەنە سەر صلاح الدین و باب و باپیرانمان کە دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆیان بۆ جەنابیان دروست نەکردیە؟ هەڵبەتە نیازێك و مەبەسێکیان لەو هێرشە ناڕەوایە هەیە. بابزانین چییە: باب و باپیرانی هەژار و قوڕبەسەرمان لە سەدا نەوەتی نانیان نەبووە بیخۆن بەدرێژایی ژیانیان کوشتەی دەستی ڕەشی نەخوێندەواری و هەژاری و نوخۆشی بوون بەدرێژایی ژیانیان نەیان زانیە کوردایەتی چیەو نەیان بیستیە کوردایەتی چیەو چۆنە لەگەڵ ئەوەشا عەلمانیە پێشکەوتنخوازەکانمان مامۆستا لەبیرو باوەڕی کوردایەتی و نیشتمان پەروەری هەموو هێرشی ناڕەواو ڕق و کینەیان بەسەردا دەڕێژن لەسەر ئەوە دەوڵەتی کوردیان بۆ جەنابی موبارەکیان دانەمەزراندووە ! ئەی برایانی خۆم ئێوە ئوستاد و مامۆستا و پرۆفیسۆری کوردایەتین دە ئێوە بۆ ڕۆڵەکانی دوا ڕۆژمان ئەو دەوڵەتە دروست کەن ئەگەر لەسەر نەخشەیەکی نوێش ناتوانن لەسەر نەخشەیەکی کۆن و هەر لە قوڕو بەرد پێکەوەی نێن با لە پاشە ڕۆژ ڕۆڵەکانمان نەفرەتتان لێ نەکەن هەروەك ئێوە نەفرەت لەباب و باپیرانمان دەکەن ئەی نەتان زانیوە ئەورۆو سبەی ئێوەش دەبن بەباب و باپیرانی ڕابردوو؟ چەند شتێکی سەیرە یەکێك نەپارەو پولی هەیە و نەجل و بەرگ نەخوێندەواری هەیە و نەهەندەسەزانە کەچی داوای دروستکردنی (ناطحات السحاب) ی لێ دەکرێ ،

بەڵام داوا لە خۆی ناکا کۆریتیێ دروست کا کە هەزاران جار دەس ڕۆیشت و ترە لەداوا لێ کراوی یەکەم!!

یاخود داوا لە (صلاح الدین ) ی ئەیوبی دەکەن کە ئەو دەوڵەتی بۆ دروست کردابان بەر لە هەشت سەدو پەنجا ساڵ لە ئەوڕۆ لەگەڵ ئەوەشا کە صلاح الدین ڕووت و قووت بوو لە هەموو هۆکارەکانی دروست کردنی دەوڵەتێکی کوردی برایانی بەڕێز و ڕۆشنبیر سەدەی صلاح الدین لە جیهانی ئیسلام سەدەی ڕەگەز پەرستی و گەل پەرستی نەبوو، بەڵکە سەدەی خوایە پەرستی و بالآیی کیتاب و سوننەت بوو. وەرن هەموو مێژووی ئەو سەردەم بخوێنەوەو لێبکۆڵنەوە بزانن یەك تاکە عەرەب ( لەهەر چین و توێژێك بووبی) عەرەبایەتی کردیەو ناوی بەڕەگەز پەرست و عەرەب پەرست ڕۆیوە ؟ نەخێر نیە، جا کەوایە کەئەوە حاڵی عەرەب بێ کە پێشکەوتووترین گەلی جیهان بووبێ لەجیهانی ئەوکات کەواتە چۆن داوا لە (صلاح الدین ) ێکی ئاوارەی شاری تکریت کە ئێستا ناوی نراوە (صلاح الدین) دەکەی کەدەبوایە بەر لە هەموو شتێ حکومەتێکی کوردی بۆ دامەزراندباین؟ لەتەمەنی شەش ساڵی ئاوارەی میصر بوو .

مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە ( ئەو مێژووەی کە ئێمە جاران لە پۆلی شەشی سەرەتایی لەساڵی ١٩٥٩ دەمانخوێند ) کە (صلاح الدین) ی ئەیوبی خەڵکی شاری تکریتە لەتەمەنی منالّی باوکی دەمرێ و مامی (شیرکۆ) پەروەردەکردنی صلاح الدین دەگرێتە ئەستۆی خۆی. قەزاو قەدەر یەك لە کوڕەکانی شیرکۆ کوڕی (والی) ئەو شارەی لەدەست دەکوژرێ. لەبەر ئەوە والیەکە پیاوێکی گەلێ موسڵمان و چاك بووە لێیان خۆش دەبێ بەڵام داوا لە شێرکۆ دەکا کەوا باشترە شاری تکریت بەجێ بهێڵن و لەبەرچاوم وون بن. ئەوانیش سەری خۆیان هەڵدەگرن هەتا وڵاتی میصر گیرنابن و لەوێ جێگیر دەبن، ئەوکاتە تەمەنی صلاح الدین (خوا لێی خۆش بێ) تەنها شەش ساڵ بوو .

( صلاح الدین) لەو وڵاتە گەورەو پەروەردە دەبێ و لەژێر سایەی کیتاب و سوننەت ئەو سەرکردە قارەمان و گەورەو بەناوبانگەی لێ دەردەچێ و دەبێتە

جێگەی سەر سوڕمانی هەموو دونیا کە بۆ جاری دووەم شاری (القدس) ڕزگار دەکا لەجەنگی گلاوی خوێناوی خاچ پەرستەکان ، ئەوە شانازی نییە بۆ کورد کە (صلاح الدین ) یکی لێ هەلکەوی ئەو شارە پیرۆزە (اولی القبلتین) رزگارو ئازاد کا لە سەدان هەزار سەربازی خاچ پەرست بەهێزی ئیمان بە خوای گەورە ، بەچی ئیمان بەخوای گەورە و ڕۆژی دوایی؟ ئەو خاچ پەرستانەی (الصلیبیون) کە بەسەدان هەزارانیان لە ئەوروپاوە هاتبوون بەتەواوی چەك و جبەخانەیان و سەرکردایەتی چەندانی وەك (ریتشارد قلب الاسد) (ریکاردۆ) پاشای بەریتانیای ئەو سەردەم ؟ ئەمڕۆ دەبینین سەدان ملیۆن عەرەب دەستە وەستان وەستاون لەبەرامبەر جولەکە ترسنۆکەکانی فەلەستینی داگیرکراو؟ باشە با لێرەدا پرسیارێك بکەین و بلێین بۆچی سەدان هەزار عەرەب ، بەلکو ملیۆنەها عەرەب مل کەچی فەرمانەکان و داخوازیەکانی صلاح الدین بوون کە کابرایەکی بێگانەی کورد بوو بۆچی ئەمڕۆکە یەك تاکە عەرەب بۆ دەهەزار کورد سەرشۆڕ ناکا یا ئەو دەهەزار کوردەش لەسەر حەق بن؟ ئاخۆ دەبێ چ بێ ئەو سەدان هەزار عەرەبەی ژێربالی کردبێ بۆ (صلاح الدین) یکی کورد؟ بێگومان ئاینی ئیسلامی پیرۆز کە دەفەرموێ (وانَّ هذه امتكم امةً واحدةً وأنا ربكم فاتقون ). گومانی تێدا نیە ئەو سەدان هەزار عەرەبە لەسەردەمی صلاح الدین لەژێر ئەو دروشمە خواییە کۆببونەوەو یەك گیان و یەك دل دەجەنگان لە دژی خاچ پەرستان، ئیتر صلاح الدین و سوپاکەی ئیسپاتی دەکەن کە ئاینی ئیسلام ڕەگەز پەرستی لەناو عەرەب و غەیری عەرەب لەناو بردبوو بەفەرمانی خوا (وأعتصموا بحبل الله جميعاً ولا تفرقوا) یەکتریان گرتبووەو ببوون بە یەك پارچە (لو انفقت ما في الأرض جميعاً ما ألَّفْتَ بين قلوبهم ولكنَّ الله ألَّفَ بينهم ..... ) الأنفال (٦٣) .

ئاشکرایە سوپاکەی صلاح الدین بەشی هەرەزۆری عەرەب بوون و بەشێکی کەمی کوردو تورك بوون، خەلکی بێخەبەری ئەمڕۆ وا تێدەگەن کە سوپاکەی هەر هەمووی کورد بووە، ئەو سوپا پیرۆزەی صلاح الدین لەکوردستانەوە بەرێ

نەکەوتبوو بۆ فەلەستین ، بەڵکو لەوڵاتی میسرەوە بەرێ کەوتبوو. ئایا سوپایەك بەتەنها سەرکردەیەك لەسەرکردەکانی کورد بێ دەتوانێ حکومەتێکی کوردی دروست بکا؟ یا دەتوانی ڕوو لەو سوپایە بکا کەیارمەتی بدەن بۆ مەبەستێکی ئارا؟ ئەو سوپایە تەنها کۆکرابۆوە بۆ جەنگان لە دژی خاچ پەرستان و ئازاد کردنی شاری (القدس) بەتایبەتی و فەلەستین بەگشتی نەك بۆ مەبەستێکی تر ، لەدوای هەندیش سوپاکەی صلاح الدین خۆ لە کوردستان دروست نەکرابوو کە پاکی سەربازەکانی کوردبێ بەنیازی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لە کوردستانی گەورە .

بەداخەوە ئێمەی کورد زۆر ڕاستی لەخۆمان دەشارینەوە یا بیرمان دەچێ، باشە ئێمەی کورد تەنها خاوەنی یەك تاکە صلاح الدین بووینەو هەموو گەلی کورد تەنها ئەو ڕۆڵەی هێنارەتە کایەوە وە چ ڕۆڵەی وەك ئەومان نەبووە لەسەردەمی صلاح الدین و پێش (صلاح الدین) کە هەستی نەتەوایەتی هەبووبێ و هەستابێ بە دروست کردنی دەوڵەتێکی کوردی ؟ بێگومان گەلێکی وەك گەلی کورد کە هەموو دەم ژمارەی وەك گەلانی ناوچەکە بووە یا زیاتر ئیمکانە خاوەنی سەدانی وەك صلاح الدین بووبین، بەلام بۆ خەباتیان نەکردیە لەپێناودامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی؟ ئایا لەبەر ئەوەبووە پێویستمان پێ نەبووە؟ ئایا نەیان توانیوە؟ ئایا ئەگەر دایان مەزراندیە ئەو دەوڵەتە کوا؟ناوی چی بوو؟ چەند ساڵ حوکمڕانی کوردستانی کرد؟ بەقیادەی کێ بوو؟ بۆ ڕووخا؟ ئەگەر ڕووخار نەما بۆچی زیندوومان نەکردەوە؟ وەك زۆر گەلان لە مێژوو چەند جاران دەوڵەتیان ڕووخاوەو لەسەر نەخشە سڕایتەوە و کەچی گەلەکەی زیندوویان کردیتەوە وەك ئیمپراتۆریەتی ئیتالی و ئەڵمانی و دەوڵەتی پۆڵەندا و چەندان دەوڵەتی تر. ئێمە بۆ لۆمەی ئەو (صلاح الدین)ە بکەین کە هەزاران کیلۆمەتر لە کوردستان دووربووەو تەنانەت کوردیشی نەزانیوە بۆ لۆمەی ئەو هەمووە (صلاح الدین ) ە نەکەین کەلەسەردەمی ئەو لەکوردستان ژیاون؟

زۆرم لا سەیرو جێگەی داخ و سەرسوڕمانیشمە سەروەختێك لەکوردستانی ئێمە عەلمانیە کوردەکان لەکاتێکدا هەزار جوێنی ناشیرین بە (صلاح الدین) ئەیوبی دەدەن ، چونکە کوردایەتی نەکردیە (جیڤارای) خەلکی (بۆلیڤیا) یان پیرۆز دەکردو سەریان بۆ وێنەکەی شۆڕ دەکرد و دەستی ئیحترام و ڕێزیان بۆ وێنەکەی بەسینگەوە دەنا ئەوە چیە خەلکی بۆلیڤیایەو لەگەل ئەوەشا شان بەشانی ڤیدل کاسترۆ لە کوبا خەبات دەکا بۆ وەدەرنانی ئەمریکیەکان لەو ولاتەو ڕزگارکردنی لەدەست حوکمەتی (باتیستا) ی ئالقە بەگوێی ئەمریکیەکان لەو ولاتە لەژێر دروشمی (من خاوەن نیشتمان نیم و هەموو دنیا نیشتمانی منەو هەر ولاتێ لە لایەن ئیمپریالیەی جیهانی داگیرکرابێ من خەبات بۆ ئەو دەکەم ! ) ، چۆن دەبێ مرۆڤ هێندە خۆی گێل و وێل کا خۆی دووچاری دژایەتیەکی ئاوابێ ویژدانی کاو (حەق) بەدوو جۆرە کۆل بپێوی؟ ئایا جیڤارا و کوبا و کاسترۆ نەفع و سوود و قازانجیان بۆ کورد چیەو چ بووە؟ دەدادەی بۆم بژمێرن نەفعەکانیان؟ (صلاح الدین) خوای لێ خۆش بێ فەرمانی خوای نەشکاندووە بەئازاد کردنی قودس لەدەست خاچ پەرستان، والله ئەو خاچ پەرستانە بێتوو سەرکەوتنیان بەسەر صلاح الدین و سوپاکەی هێنابا والله نەعەرەبەکیان دەهێشت و نە کوردێك ، چونکە موسلمان بوون و هەروەك چۆن خەلکی شاری قودسیان تێکرا سەربڕی کە ژمارەیان لە حەفتا هەزار کەس پتر بوو .

ئەو سەدان هەزار یا ملیۆنەها کوردەی ئەوڕۆ داوا لە صلاح الدین دەکا کە دەبوایە کوردایەتی کردباو دەولەتێکی کوردی دامەزراندبا لەبەر خاتری کورد و کوردستانیان نییە ( نەوەللا ) بەلکو هێندە دەترسن لە دوژمنانی کورد کە ئەگەر صلاح الدین ئەو دەولەتەی دروست کردبا ئەمڕۆ ئەو ترسەیان نەدەما ئەوجابە ئاسوودەو دلنیایی تا مردن بەهەواو هەوەسی خۆیان ژیانیان دەبردە سەر ، واتا لەبەر ترسنۆکی و بێ غیرەتی ئەو داوایە ناڕەوایە لە صلاح الدین دەکەن ، چونکە دەزانن ئەو هەواو هەوەسەی ئەمڕۆ تێدا غەرق بوونە لەسەر کولەکەی فاقێیە لەدەست شالاوی دوژمنانمان کە کات و ساتی بۆ نییە.

٧- یەك لە ڕاستیە هەرە گەورەکانی مێژووی ڕۆژهەلاّتی ئیسلام ئەوەیە کە دەولّەتی ئەمەوی و دەولّەتی عەباسی و دەولّەتی عوسمانی تا دەستیان بە ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە گرت بالاّبوون و بەهێز بوون لەسەردەمی ئەمویەکان سوپای ئیسلام بە قیادەی (عوقبەی کوڕی نافیع و ئەبو موسلمی باهیلی ) توانیان بگەنە سنوری ولاّتی چین لە ڕۆژ هەلاّتەوە ،( تاریقی کوڕی زیاد ) یش لەڕۆژئاوا ولاّتی ئەندەلوسی فەتح کرد و لە کوفرو خاچ پەرستی ڕزگاری کردن تاکو ئەمڕۆش (تەنگژە = مضیق) چیای تاریق بەناوی ئەوە (مضیق جبل طارق) وەلەسەردەمی عوسمانیەکان( محمد الفاتح) توانی بۆ یەکەمجار فەتحی شاری قوستەنتینە بکاو ئەو شارەی کە بەدرێژایی مێژوو کەس نەیتوانیبوو خۆی لە شوورە بلّندو چڕۆ بەهێزەکانی بدا ئەو قائیدو موسولّمانە توانی بگاتە ولاّتی نەمساو شاری (ڤیەننا ) ی پایتەخت گەمارۆبدا ،لەسالّی ١٤٥٣ ی زاینی .

بەلاّم کاتێ کە پشتیان لە ئیسلامەتی کرد و فەسادو ئاشوب و بەڕەلّلاّیی و بێ یاسایان تێکەوت لەسەردەمی پاشاو سولّتانەکانی دوای (مأمونی) کوڕی هارونە ڕەشید خەلیفەی عەباسی وە لەدوای سولّتان سلێمان قانونی سولّتانی دەولّەتی عوسمانی،بەخێرایی بەرەو نەمان چوون وبەجارێ تەفرو تونا بوون .

لەو ڕاستیانە بۆمان بەدیاردەکەوێ ( لەمێژووی هەزارو چوارسەد سالّەی ئیسلام ) کە ئاینی ئیسلام نەك گەورەترین هۆکاری دروست کردنی دەولّەتە بۆ هەر گەلێکی ئیسلام کەدەستی پێوە بگرێ و بیکا بەدەستور و یاسای دەولّەتەکەی بەلّکو گەورەترین هۆکارە بۆ بەردەوام بوونی هێزی دەولّەت و بەپێوە ڕاوەستانی. هەرکاتێ دەستی لێ بەردا بەردەبێتەوەو لەناو دەچێ.

٨ – مرۆڤ گەر کەمێ بەووردی بیرکاتەوە داوەرێتەوە خۆی و ماوە بەمێشکی خۆی بدا کە کەمێ ئەسپی خۆی تاوبدا لەنێو جیهانی ڕاستی و واقیع و ڕاستی زۆر سەیرو هاسان و ژیرانەی بۆ بەدیار دەکەوێ لەو ڕاستیانەی کە لەهەلّدێرێکی سامناکی دەگێڕێتەوە .

بێ گومان زۆرن ئەو ڕۆڵە کوردانەی کەدەڵێن بڕوامان بەخوای گەورە هەیە (جل جلالە) لەگەڵ ئەوەشا عەلمانیەکان رایان مێشك بەبۆگەنیناوی کوفرو شوشتۆتەوە کە ئەوانیش وەك عەلمانیەکان بڵێن ئاینی ئیسلام هۆی دواکەوتنمانە، بێ خەبەرن لە هەندێ کە گاڵتە بە خۆیان دەکەن بەوەی کە خۆیان هێناوەتە ڕیزی کەسانی نەزان و تاریك بیرو بێ هۆش ، هەروەها خۆیان دووچاری دژایەتی کردیە ( تناقض ) لەبیریان چۆتەوە لەبیرخۆیان دەبەنەوە کەهەرکاتێ دەگەنە تەنگانەو ناخۆشی و مەترسیەك، مەترسیەکی ئەوتۆ کە ناتوانن خۆیان لێ ڕزگار بکەن و خۆیان لەبن چەپۆکی دەرهێنن و لەبەرامبەری دەستە وەستان دەوەستن و هەناسە بڕکێ و دڵە کوتێ دەیان گری یەکسەر هاواری خوای گەورە دەکەن کەڕزگاریان کا لەو تەنگانە سامناك و کوشندەیە !! ئەو حاڵەتەی مرۆڤم بەلاوە سەیر نیە ،چونکە ئێمەی موسڵمان لەهەر هەموو شتێك کە پێویستمان پێی هەبێ ، لەسەر ئەو ئەرزە ئیسلام فێری کردین و ئاگاداری کردینەوە ، ئەوەتا لە چەندان ئایەت دەفەرموێ ئەوە حاڵی مرۆڤە هەرکاتێ تووشی تەنگانە دێ (وإذا مسَّكم الضرُّ في البحر ضلَّ من تدعونَ إلا اياهُ...) الأسراء٦٧ .

بەڵێ ئەو حاڵەتەی مرۆڤم بەلاوە سەیر نیە بەڵام ئەوەی کە دەمەوێ موسڵمانی کوردی لێ ئاگادار کەمەوە بۆ ئەوەی بزانی کە ئیسلام کوردی دوا نەخستیە ئەوەیە: تۆ کاتێ دەکەویە تەنگانە هیچ دەسەڵات و توانایەکت بەرامبەر ئەو تەنگانەیە نامینێ و عەقڵ و عیلمت لەبەرامبەری ڕادەوەستێ و هەرچەندی بتەوێ خۆت ڕزگارکەی ناتوانی ، ئەوسا یەکسەر هاواردەکەیە خوای گەورەو پڕ بەدەم هاوار دەکەی کە ڕزگارت بکا ، چونکە دەزانی لەو زیاتر کەست بەهانات نایە و هیچ هێزێك نییە ڕزگارت کا تەنها خوای گەورە نەبێ، لەوکاتەدا ئەوانەی کە بەلاتەوە گەورەو بەهێز و توانان و لە خۆشەویسترین کەسانی ژیانتن و لەوانەیە سوجدەو کڕنوشیشیان بۆ بەری هێندە بەلاتەوە گەورەن و وا دەزانن گەلی کورد بەبێ ئەوانە ماڵ وێرانە و هەرگیز پێش ناکەوێ و پێشکەوتن و هێزی کورد لەدەست ئەوانە کەچی بە ماوەی کەمتر لە چرکەیەك هەر هەموویان لەبیر دەکەی و

یەکسەر بادەدەیەوە سەر خوای گەورەو رووت بەلای ئەو وەردەگێڕی و پڕ بەدەم و پڕ بەدڵ هاواری دەکەیتێ و هەروەك بڵێی بەدرێژایی ژیانت پەرستوتەو کەسی ترت لەبری ئەو بەگەورە و بەهێزو توانا نەزانیوە ، چونکە لە قەرارەتی نەفس و دڵ و دەرونت زانیت لەو کاتە زێدە سامناك و ناسکە لەئەو زیاتر کەست بەهانا نایەت ، هاوارت کردە ئەو کەسەو هانات بردەبەر کە رۆژ هەتا ئێوارەو ساڵ دوانزەی مانگ و بەلکو بەدرێژایی ژیانت ئاینەکەی ( ئاینی پیرۆزی ئیسلام ) تاوانبار دەکەی و گاڵتەی پێدەکەی و بەهۆکاری هەرەگەورەی دواکەوتنی کوردی دەژمێری!! مرۆڤ چۆن دەبێ هێندە دوژمنایەتی خوای گەورە و ئاینەکەی بکاو ئاینەکەی بە ئاینی سەدەی تاریکی لە قەڵەم داو دواتریش لە بچوکترین تەنگانە هاواری بکاتێ؟ بەڵێ ئاوایە مرۆڤ لەتەنگانەدا لەرەحم و هێزی هەموو کەس بێ بەشە تەنها هی خوای گەورە نەبێ، ئایا ئاینی ئەو خوایە گەورە دەبێ هۆکاری هەرە گەورەی پێشکەوتن بێ یادواکەوتن؟ . هاواری دەکەیتێ لەسەر رزگارکردنی بەنرخترین سامانت کە (گیانە) بەلاّم هاواری ناکەیەی کەگەلەکەت پێش بخار بیپارێزی و بۆیژیدا لە ئەرز و ئاسمان لەسەر داوای خۆی ، واتا: خوای گەورە خۆی ئەو داوایەمان لێ دەکاو دەفەرموێ: (ولو آمنَ أهلُ القُرى وأتّقوا لفتحنا عليهم بركات من السّماءِ والأرض ولكن كذّبوا فأخذناهم بما كانوا يكسبون) (الأعراف ٩٦) ، کەواتە — برایان — پێشکەوتن و دواکەوتنمان لەدەست خۆمانەو کردەوەی خۆمان پێشکەوتن و دواکەوتنمان دیاری دەکات ، بڕی پێشکەوتنمان بەستراوەتەوە بە تەقوامان لەبەرامبەر خوای گەورە چەند تەقوامان زیاتر بێ هێندە پێشکەوتنمان زیاتر دەبێ دەنا بە پێچەوانەوە .

ئەی بۆ کافران وا پێشکەوتوونە خۆ هەرچی تەقوابێ خۆیان لێ بێ بەش کردیە؟ خوای گەورە ( سبحانه وتعالى ) بەئایەتێکی کورت و پڕمانا و پیرۆز وەلاّمی ئەو پرسیارە دەداتەوە و دەفەرموێ (وما كان ربُك ليُهلك القُرى بِظُلْم وأهلها مصلحون) (هود ١١٧) واتە خوای گەورە هیچ

ولأتێکی بەهۆی کوفر وێران ناکا کەمادام هاولاتیانی لەناو خۆیان بەکاری چاك و عیلم خەریك بن هەتا کاتی خۆی .

مانای ئیصلاح بەلای هێزەکانی کوفرو ئیلحاد ئەوەیە هەموو هۆکارەکان هێزو دەسەلات و توانا وەدەست بهێنن بۆئەوەی نەك هەر لەبەردەستی بێگانە زەلیل و ڕیسوا نەبن،بەڵکو هەموو جیهانیش زەلیل و ڕیسوا کەن ولەهەموو بوارەکانی عیلمی و ئابووری و سیاسی و عەسکەری . ژیانێکی تەنها نەمرو نەژینیان بۆ دروست کەن ، لەو بارەوە بەتەواوی تیۆری ( داروِن ) ئەنجام دەدەن بەڕێژە لەسەدا سەد . ئەو تیۆرە دەڵێ:- (التنازع من أجل البقاء والبقاء للاقوى) مانای: لەنێو ئەو بینەو بەردەی ژیانی دونیا دەبێ تەنها بەهێز و توانا بێ هێز و لاوازەکان هەموو بخۆن ، واتا: کەس مافی ژیانی نییە لەسەر ئەرز تەنها گەلانی بەهێز و توانا نەبێ .

دیسانەوە خوای گەورە لەبارەی گەلانی کوفرو ئیلحاد دەفەرموێ: (مَنْ كانَ يريد الحياة الدنيا وزينتها نوفِّ اليهم أعمالهم فيها وهم فيها لا يُبخسونَ). بەلام: (أولئك ليس لهم في الآخرة إلا النّار وحبطوا ما صنعوا وباطل ما كانوا يعلمون).

خوای گەورە لەو ئایەتە پیرۆزە پەیمانی دایە کە ئەوانەی تەنها ژیانی دونیاو جوانی و ڕازاندنەوەی ژیانی دونیایان دەوێ هەموو شتێکیان پێ ببەخشێ ، بەلام کارو کردەوەیان ، کە مادام ئیمانیان نیەو موسڵمان نین هەر هەمووی بەتاڵەو بوویتە (هباءً منپور) واتا ئەو تۆزە وردانەی کەلەناو تیشکی ڕۆژ بەدیار دەکەوێ کاتێ کە لە کونێکەوە دێتە ژوورێکی تاریك و واتا هیچ نرخ و کێش و سوودی نییە بۆیان .

بێ گومان ( وەك لەهەمووومانەوە ئاشکراو ڕوونە ) گەلانی کوفرو ئیلحاد ژیانی دونیایان بەچاکی هەڵبژاردووەو هەموو شتێکی بەوپەڕی دڵسۆزی و بێ ورچانی و ماندوو بوون لەپێناو دەکەن، لەبەر ئەوە ( دەیانبینین ) گەیشتونەتە پلەی هەرەبەرز لە هەموو بوارەکانی ژیان بەتایبەت زانیاری و تەکنەلۆجی و ئابووری و لەشکری . لەبەرئەوە شانازی بەخۆیان دەکەن و کەشخەو

لووت بەرزی بەسەر هەموو دونیا لێ دەدەن. لەهەر لایەنێك سەیریان دەكەی ئێمەی موسڵمانی كورد نەك لەكاروانی ئەوان بەجێ ماوین ، بەڵكو سەدان ساڵمان ماوە بەرێ كەوین، تەنانەت ئەو ئامێرانە كە ئەمڕۆ دروستیان كردیە ئێمە چەندان ساڵمان دەوێ ناوەكانیان فێربین و كاریان پێ بكەین، ئەوە لەو ئەنجامەی كە بەڕاستی ژیانی دونیایان بەهەموو شتێكەوە دەوێ.

بەڵام ئێمە كورد — زۆر بەداخەوە — نەژیانی دونیامان دەوێ وەك ئەوان، نەژیانی ئاخیرەتیش ، چۆن و لەبەرچی؟ لەبەر ئەوەی دووچاری گەورەترین هەڵە بووینە لەدرنیاو لە مێژوو بەوەی كە ( بەگوێرەی عەقڵی خۆمان ) پشتمان بەوان بەستووەو وازمان لە ئەصلی پێشكەوتن هێنایە كە (قورئانی پیرۆز و سوننەتە پاكەكانی پێغەمبەرە (علیە الصلاة والسلام ) وادەزانن كە بەوحاڵە پێش ▪▪كەوین و دەبینە خاوەن هێزو توانا وەك ئەوان ، عیززەت لەبری خوای گەورە لەوان داوادەكەین، یان هەر نەبێ بیرمان وایە ئەوان لە ئاغووتەكانی تورك و فارس و عەرەب دەمان پارێزن. بەخوا بەخوا یەكجار بەسەهوو چووینە یەكجار بەهەڵە چوونە، چونكە موستەحیلە هیچ ئاغایەك لەدونیا هەبووبێ خزمەت كاری خۆی كردیتە ئاغا ، بەڵكو رۆژ بەدوای ڕۆژ زیاتر بێ نرخی كردیە و سەر شۆڕو مل شۆڕی كردیەو زەڕەیەك غیرەت و عەقڵو عیززەتی تیا نەهێشتووەو كردویەتی بەگیانلەبەرێكی مل كەچ تەنها خزمەتی ئاغا بكا، موستەحیلە ئەوجارەش موستەحیلە هێزەكانی كوفرو ئیلحاد لێ بگەڕێن گەلێكی موسڵمانی وەك كورد ڕۆژێ لەڕۆژان بالآبێ. خوای گەورە دەفەرموێ (بشِّر المنافقين بأنَّ لهم عذاباً اليماً الذين يتخذون الكافرينَ أولياءَ من دون المؤمنين ، أيبتغون عندهم العزَّة فإن العزَّة للهِ جميعاً) النساء (١٣٨ ١٣٩) واتا: مزگێنی بدەن بە منافیقانی دوڕوو سێ ڕوو بەعەزابێكی یەكجار قورس ، كێن ئەو منافیقانە؟ ئەوانەن كە پشتیان بە كافران بەستووە لە بری موسڵمانان ، ئایا لەو كارە ناڕەوایەیان مەبەستیان ئەوەیە عیزەت و ڕێز و نرخیان دەس كەوێ؟ بەسەهوو چووین عیززەت و حورمەت و گەورەیی بۆ مرۆڤ تەنها لەلای خوای گەورەیە لەلای

کافران نییەو نابێ ، عیززەت بەتەنهاو بەتەنها هی خوای گەورەیە کەسێ دەستی دەکەوێ کەلەسەر بەرنامە پیرۆزەکەی ئەو بڕوا.

ئێمەی کورد ئەمڕۆ ( زۆر بەڕاشکاوی و بەئاشکرا ) ژیانی دونیاشمان ناوێ ئەگەرچی ژیانی دواییمان لەقیس خۆمان دایە ، وا تێدەگەین لەقیسمان نەچووە؟ چۆن و لەبەرچی؟ لەبەر ئەوەی بەبێ هیچ هەل و مەرجێك و پەیمانێك خۆمان تەسلیمی هێزەکانی کوفرو ئیلحاد کردیە کە بێگومان ئەوانیش بەهەموو شێوەیەك ڕووتیان کردینەوە لە هەموو هۆکارەکانی مرۆڤایەتی ، ئەوسا گەلێك لەهەموو هۆکارەکانی مرۆڤایەتی ڕووت کرابێتەوە پێشکەوتنی چی؟ چۆن ڕووت نەکرایتەوە لە هۆکارەکانی پێش کەوتن لە هەموو لایەنەکانی ژیان؟ دەپێم بلێن چمان بەدەستەوە مایە؟ (ئەمڕۆ لەژیانی دونیا چیمان بۆماوەتەوە ؟ )وەختە بلێم هیچمان بۆ نەماوەتەوە، نەخاوەن خاکین و نەخاوەن سامان و بەلای سەربەخۆیەوە هەرمەچوو، ژیان هەروکو هەموو گیان لەبەرێکی ژێرەوەی مرۆڤ دەبەینە سەر، بەڵکو کەمتریش لە هەندێ جار، بەڵام زۆربەمان هەستمان بەو مەترسیە نەکردیە کە لە هەموو لایەك گەمارۆی داین و لەهەموو ڕۆژگارەکانی ڕابردوو زیاتر ژیانمان لە تەلەزگەیە، بەڵام هێزەکانی کوفرو ئیلحاد لەپێناو بەرژەوەندی کاتی خۆیان دەستیان پێوە

گرتین کە نەکەوین . هەرکاتێ دەستیان لێ بەرداین و بەرژەوەندیان لەگەڵماندا نەما خوانەبێ کەس نازانێ چیمان بەسەر دێ .

ئەورۆ ئێمەی موسڵمانی کورد بەلای کەمەوە لە کوردستانی باشوورمان دووچاری چوار جۆرە نەزیفی کوشندەو ترسناك بووینە(خوای گەورە ڕزگارمان کا) بەهۆی ژیانی ژێردەستیمان و داگیرکردنی ولاتمان لەلایەن هێزەکانی کوفرو ئیلحاد ، ئەوچوار نەزیفیەش ئەمانەن:

١- نەزیفی ئەخلاقی :- ڕۆژبەڕۆژ ژیانمان بەرەو ژیانی تازەلی و لەتازەلیش کەمتر دەڕوا بەدڕەوشتی و بەرەڵلایی(الفوضى الجنسي) لەپەرەساندن دایە کەبەلای منەوە گەورەترین مەترسیە نەك لە کوردستان بەڵکو لەهەموو دونیا و

بەخێرایی ژیان لەسەر ئەرز بەرەو نەمانێکی مسۆگەر دەبا ، من وادەزانم هیچ بەلایەك لەو بەلایە گەورەتر نیەو نەبووە لەبەر ئەوەی کۆمەڵگای مرۆڤ دەگۆڕێ بۆ شەڕترین گیانلەبەری سەرزەوی .

٢- نەزیفی عیلمی - زانیاری :- لەهەموومان ئاشکراو روونە کەئاستی زانیاری و زانین لەکوردستان یەکجار دابەزیوە ، ئەوەندە بەسە کەبڵێم مامۆستایەکی تازە دەرچووی ئامادەیی ئاستی زانینی ناگاتە ئاستی زانینی قوتابیەکی سەرەتایی پۆلی شەشەمی ساڵانی شەستەکان .

٣- نەزیفی عەسکەری:- من بڕوام وایە ئەمڕۆ لەهەموو کوردستان سەد پێشمەرگەی جەرگسۆز نەبێ دیفاع لەکوردو کوردستان بکا ، هەرکاتێ لێمان قەوماو دووچاری شەڕی گەر دوژمنان بووین لەبەر چەند هۆکارێکی یەکجار گەورەو بەرچاو کە ئێرە جێگەی باسکردنی نیە .

٤- نەزیفی ئابووری:- کەم شوێن هەیە لەدونیا وەك کوردستانی ئێمە خاوەنی سامانی سروشتی بێت وەك نەوت، سامانی کوردستان ئەگەر لەبەر دەستێکی بەتەقوار ئەمین بێ بەلای کەمەوە کیفایەتی سەد ملیۆن کەس دەکا، بەلام زۆر بەداخەوە ئەو سامانە زۆرە کەس نازانی چی لێ بەسەر دێ و کێوە دەچی؟ هەرئەوەندە دەڵێم بێخێرترین هێزەکانی کوفرو ئیلحاد بەهەر هەموویان دەمیان تێناوەو فڕان فڕانە لەسەری ، بەحاڵەحاڵیش گەلەکەمان شتێکی ئەوتۆیان لێ دەست ناکەوێ ، بەکورتی وەك دابەستەیەکی مردارەوە بووی لێ هاتووە کە جۆرەها تاژی و توله و زیندەوەر دەمیان تێ ناوە هەربزانە کۆتایی هات و ئێسقانەکانی لێ دەمینێ ئەویش دوای ماوەیەك دەڕزی و شوێنەواری بەیەکجارەکی نامینێ ، نووسین لەبارەی ئەو نەزیفە (نەزیفی ئابوری) بەموجەلەدێك ئەگەر تەواوبێ لەبەر ئەوە هەر ئەوەندە بەسە کە ئیشارەی پێدەم و خەڵك لێی ئاگادار بیتەوە .

٩ - ئایین بەگشتی واتا: هەموو ئاینییێك گەورەترین هۆیە لەسەر کۆکردنەوەو تەبایی و یەکگرتنی رۆڵەکانی هەر گەلێ ، من وادەزانم هەر ئەو

هۆیە گرنگە بووە کە بوویتە هۆی دروست کردنی ئایین بەر لەوەی خوای گەورە ئاینی خۆی بنێرێ ، ئایین کاریگەریەکی گەورەتری هەیە لەو کاریگەریەی کە هەیەتی لەبەرامبەر کۆکردنەوەو تەبایی و یەکگرتنی رۆڵەکانی گەل کە ئەویش دڵنیای و ئاسودەیی دروست دەکا لەنێو دڵ و دەروونی مرۆڤ . مرۆڤ بەبێ ئایین هەمیشە دڵ توندو دوودڵ و مشەوەش و ترسنۆك و بێ بڕوا بەخۆی و بەهیچ کەس لەبەر ئەوە دەبینین بەدرێژایی مێژووی مرۆڤ گەلانی سەرزەوی بەر لەوە خوای گەورە ئاینی پیرۆزی خۆیان پێ ببەخشێ بۆخۆیان ئاینێکیان دروست کردووە و دەستورو یاسایەکی تاریك و تنۆکیان بۆخۆیان دانـاوە لەپەنارا خۆیان لەکۆڵ و ترس و لەرزو نائاسوودەیی و نارەحەتی گیان و دڵ کردیتەوە بەدرێژایی مێژووش بەدڵ و گیان پاراستویانە و جەنگیان لە پێناو هەڵگیرساندووە. هەرکاتێ ئاینەکەیان کەوتبێتە مەترسی .

هەندێ جار ئایین بەچاوێکی گەلێ گەورەترو بەنرختر سەیر کراوە لە (زمان) بۆ نموونە هۆی هەرەگەورەی جیابوونەوەی (ئیرلەندای باشور) لە بەریتانیای زل هێز مەزهەبی ئایینی بوو، بەریتانیەکان کاسۆلیك بوون ، بەلاّم ئیرلەندای باشور (پرۆتستان) بوو، بەدرێژایی مێژوو کەس نەیبیستووە و کەسیش نەی دیوە هیچ گەلێك وازی لەئاینی خۆی هێنابێ ، بەڵێ زۆرجاران بەرەو کزی و لاوازی چووە ، بەلاّم هەرگیز بەیەکجاری نەمردیەو نامری .

والەبەر چاومانە تاکە شتێ کە جۆرەها جولەکەی زمان لەیەك جیای کۆکردیتەوە لەفەلەستینی داگیرکراو ئاینە گۆردراوەکەیانە، کەهەرکۆمەڵە جولەکەیەی لە شوێنێکەوە هێناوە و مۆڵی کردینە لەسەر ئەو خاکەی موسڵمانان و قودسی پیرۆز هێندێکیان رووسین و هێندێکیان پۆڵۆنی و هێندێکیان هۆڵەندی و هێندێکیان عیراقی... هتد .

کەواتە مرۆڤ نابێ هێندە خۆی گێل و وێل کا لەئاستی ئەو ڕاستیە مێژوویی و واقیعانە و خۆی خەڵکی ساویلکە ، دەست خەڵەت دا کە کە گوایا ئاینی پیرۆز و ڕاست و پاکی ئیسلام بووبیتە هۆی دواکەوتنی گەلەکەمان ! گەلی موسڵمانی

کورد ) ئاینێکی وەك ئاینی (فەلەکان = دیانەکان) یاخود ئـاینێکی وەك ئـاینی جولەکان کە فرِیان بەسـەر ڕاسـتی یـەوە نـەماوە و بەرێـژەی سـەدا سـەدیان لیَ گۆرِدراوە ، بەدرێژایی مێژوو زوڵم و ستەمیان لەپەنا کراوەو کوشت و کوشـتاریان لەسەر ڕوویدایە لەگەڵ ئەوەشا لەکار نەکەوتینە و تاکو ئەمرِۆش لە هۆکارە هەرە گەورەکانی کۆبوونـەوەو تـەبایی و یـەکگرتنی گـەلانی کـوفرە ، کەچـی ئـاینی ئیسلامی پاك و پیرۆز کە ڕاستیەکی ڕەهایەو بەهیچ جۆر نـالویَ مـرۆڤ لـە هـیچ لایەنێکەوە ( هەچەندە پێشکەوتووبیَ ) پێشی بکەوتەوە چۆن گەل دوادەخا ؟

دەوەرن هۆیەکانی دواکەوتنی کوردم بۆ بژمێرن و لێی وردبینەوە و بزانین کام هۆیان ئاینی ئیسلام لێی بەرپرسیارە؟ بزانن کام ئایـەت لـە ئایەتـە پیرۆزەکـانی قورئان یا کام حەدیس لە حەدیسە پیرۆزەکانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام ) ئەو هۆیەی دروست کردیە کە کوردی پیَ دواکـەوتووە؟ شـایانی وەبیرهێنانەوەیـە ئاینی ئیسلام هیچ کاتیَ و لە هیچ شـوێنیَ بەرپرسـیار نییـە لەهەڵـەو سـەهوو تاوانی هیچ کەسێك ، هیچ کەسێك بـەناوی ئیـسلام کـاری کردبـیَ و بەرپرسـیار بووبیَ و یاخود پاشایەك بووبیَ یا سەرۆکێك بووبیَ ، خەڵکی موسڵمان دووچـاری هەڵدێر کردبیَ بـەناوی ئیـسلام ، دەبـیَ چـاك بـزانین ئـاینی ئیـسلام تاوانبـارو بەرپرسیار نییە لەهەڵەو تاوانی ئەو پاشایە یا ئەو سەرۆکە لەبەر ئەوەی قورئان و حەدیس ئەبەدەن هەڵەو بە سەهو چونیان تێدا نییـە تاموسـڵمانان بەهەڵەبیـەن یاخود تووشی تاوانیان بکەن.

لێرەدا پرسیارێك دەکەین و دەڵێین: ئێمەی موسڵمانی کورد گەر وازمـان لـە ئیسلام هێنا ئایا بچینە سەر چ ئاینێك؟ بەر لە هەموو شتیَ دووچاری گەورەترین هەڵەدەبین بەو کارە ناڕەوایە لەدواتر گەورەترین بۆشایی لە ژیانمان دروسـت دەبـیَ بەهیچ شتێك پرِنابێتەوە ، چـونکە ئـاینی ئیـسلام ئۆتۆمبیـل نییـە بەکـەیف و هەوەسی خۆمان مۆدیلی بگۆرِین،کـاتیَ بـیر لەئەنجامـدانی هەڵەیـەکی واگـەورە بکەینەوە دەبیَ بەر لە هەموو شتیَ بیر لە لـەوە بکەینـەوە چ ئاینێـك بۆخۆمـان دروست بکەین یان بەچ ئاینێکی بەناوبانگ بیگۆرِینەوە ؟ بـە ئاینـە گـۆرِدراو و

پوچەکەی جولەکان یاخو بە ئاینە پوچەکەی نەسارایان کە فرِیان بەسەر راستیەوە نەماوە ئەسەری ئاینیان پێوە نەمایە لەگەڵ ژیانی مرۆڤ هەموو پەیوەندیەکیان پچرایە و هەموو کرایتە ئەفسانەو خەیاڵ و هەڵەی کوشندە و کوفری یەکجارەکی؟

بێگومان کەسێ بڕوای وابێ کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام کوردی دواخستووە دەبێ ئەوکەسە ئامادەبێ بەیەکجارەکی واز لەو ئاینە بهێنێ و بیگۆرِیتەوە بە ئاینێکی دیکە ئەو ئاینەش یا ئاینی جولەکە و دیانانە یا خۆی بە مولحیدی بهێلێتەوە و لەژێر سێبەری ناسێبەری ئەو سێ لایەنە کوشندە و بۆگەنە ژیانی خۆی باتەسەر کە هەرگیزاو هەرگیز عەقڵ و عیلم و ویژدانی مرۆڤ پێیان رازی نیەو نابێ ، بۆچی؟ ئەوەتا ئاینی جولەکە بەئاشکرا و بەو پەرِی بێ شەرمانە دەڵێ (عوزەیر کورِی خوای گەورەیە سبحانه وتعالی) پەنام بەخوا لەو شیرك و کوفرە زلە کە هیچ تاوانێك نیە بارتەقای بێ ، هەروەها ئەوەتا ئاینە سەیرو بێ ماناکەی دیانان کەدەڵێ (عیسی علیه السلام ) کورِی خوایەو (مەریەم علیها السلام) ژنیەتی (أعوذ بالله ) لەو شیرك و کوفرە گەورانە کە (تکاد السماوات والأرض یتفطرن من فوقهن ) خوای گەورە لەو بارەیەوە شاهیدیان لەسەر دەداو دەفەرموێ (وقالتِ الیهود عزیر أبن الله وقالت النصاری المسیحُ ابن اللهِ ذلك قولهم بأفواهم یضاهِؤن قول الذین کفروا من قبل قاتلهم اللهُ أنی یؤفکون) (التوبة ٣٠ ).

واتا : خوای گەورە لەو ئایەتە پیرۆزە و گەورەیە شاهیدی لەسەر جولەکەو دیانان دەدا ئەوجا وەرە قەومێك خوای گەورە بۆخۆی شاهیدی لەسەر کوفریان بدا دەبێ ئەو قەومە چەند موشریك و کافربن (وکفی بالله شهیداً) (وَمَن أصدقُ من الله حدیثاً) دەفەرموێ جولەکەکان دەڵێن: (عوزەیر پێغەمبەر علیه السلام ) کورِی خوایە(سبحانهُ وتعالی ما یقولون غلوّاً کبیراً)کەواتە شتێکی بەدیهیە دەبێ دایکی عوزێر خێزانی بێ (اعوذ بالله)هەر وەها دیانەکان دەڵێن (عیسی)( علیه السلام )کورِی خوایە و مەریەم خێزانیەتی ( اعوذ بالله) لەراستیشدا لەناخی دڵیانەوە دەزانن کەدرۆزنن، بەلام درۆیەك درۆیەکی ئەو وتۆکە

تەنها ئەوان کردویانەو کەس بیری لە کردنی ئەوجۆرە درۆ گەورەیــە نەکردیتــەوە . لەناخی دڵیانەوە دەزانن کە خــوای گــەورە بــێ هاوبەشــە و تــاك و تەنهایــەو نــە پێویستی بەژن هەیەو نەکوڕو کچ ، تەنها لەدژی ڕاستی و عیناد و ســوور بوونــە لەسەر ئەنجامدان و پەرەپێدان بەو کوفرە گەورە، چونکە هیچ کەس نییە لــەدونیا لە ناخی دڵیەوە کەنەزانی خوای گەورە بێ شــەریکەو (لــیس کمثلــهُ شــيء وهــو السمیعُ البصیر) (الشوری ١١) وەك هیچ مەخلوقێکی خۆی نیەو نــابێ ئەگــەرنا لە خوایەتی دەشۆرێ ( پەنام بەخوا ) بێگومــان هیچ شــتێ نیــە لــە گــەردوون و بوونەوەر کە مــەخلوقی ئەو نەبێ ، ئەو بە (کُن) دروستی نــەکردبێ لــە نــەبوو . لەبەر ئەوە خوای گەورە زۆر بەتوونــدی . لــەنێو ئایەتەکــە بەلەعنــەتیان دەکــار دەفەرموێ چۆن ئەو درۆ و بوهتانە بەخوای خۆیان دەکەن .

ئەوسا چۆن دەبێ مرۆڤ هێندە نەزان و بێ عــەقڵ و گــومرابێ بــەدوای ئــەو جۆرە قەومانە بکەوێ کە خوای گەورە بەلەعنەتی کردون لەعنەتێکی ئەبەدی.

زۆر بەلامەوە شتێکی سەیرو زێدە نەزانی و گومڕاییە مرۆڤ ساڵەهای ســاڵە تەمەنی خۆی لەنێو گەلێکی موسڵمان باتەسەر لەگــەڵ ئەوەشــا ڕۆژێ لــە ڕۆژان بیرلەوە نەکاتەوە بزانی ئاینی ئیسلام چیە؟ چ لەناو لاپەڕەکانی قورئان و سوننەت دا هەیە؟ ئاینی خۆی نەناسێ و بای زەڕەیــەك تێــی نەگەیــشتبی لەگــەڵ ئەوەشــا تاوانباری کا لە بەرامبــەر گــەورەترین کێــشەی گەلەکــەی کــە دواکەوتنیــەتی لەبەرامبەر مەسەلەیەك کە ئاینی ئیسلام نێوان ئەرزو ئاسمان لــە دروســتکردنی ئەو مەسەلە دوورە ، بەوچەشنە خۆی دووچاری گەورەترین بەلاّو فیتنە بکا بەوەش نەوەستێ خۆی دووچاری بەلاّو فیتنەیەکی لەوەش گەورەتر بکا ئــاینی ( نائــاینی جولەکەو دیانانی) پێ لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام چاکتربی کەبەملیۆنەها کەسی لە شێوەی خۆی وشەیەکی لێ نەخوێندۆتەوە .

## ڕاستیەك:

من لەبەرامبەر ئەو کەسانەی کە ئەوە بیروڕایانە، ژیانی خۆیان بنیات ناوە لەسەر شیرك و کوفرو گومڕایی ، تەنها بیرم لە بەرامبەریان بۆ یەك شت دەچێ ، وادەزانم ئەو کەسانە چاك دەزانن ڕاستی لە کوێوەیە؟ چاك دەزانن کە ئیسلام ڕاستەو هیچ گومانی تێدا نیە ، بەلاّم شەیتان پەی پێ بردوونەو بەزمان ئینکاری دەکەن و هەزارو یەك عەیب لە ئاینەکەیان دەدۆزنەوە تا خۆیان لەو ئاینە پیرۆزە بەرنەدەر ، بۆئەوەی بەلایانەوە هاسان بێ خۆیان لەبەر ئەو ئەرکانەی ئیسلام فەرزی کردیە بەسەر موسڵمانان وەك (نوێژ ، زەکات، ڕۆژو ، حەج) دورکەنەوەو لە قومارو ئارەق و زیناو بەدواکەوتنی هەواو هەوەس ، بێ کەیفی خۆیان نەکەن، بەدیهیە کە هەرکاتێ گوتیان ئیسلام لەهەموو شتێ چاکترە و ڕاسترە ئەوسا دەبێ مل کەچی ئەنجامدانی هەموو ئەرکەکانی بن و وەك هەموو موسڵمانێك تەسلیمی فەرمان و داواکاریەکانی بن، کەئەوەش بێگومان بارێکی یەکجار قورسە بەسەر شانی مرۆڤەوە بەتایبەتی (نوێژەکان) کە خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموێ (وأستعينوا بالصبر والصلاة وإنها لكبيرة إلا على الخاشعين الذين يظنون أنهم مُلاقوا ربهم وأنَّهم اليه راجعون) موسڵمان ئەو موسڵمانەیە کە هەمیشە لەسەر داواکاری خوای گەورە هەمیشە هانا دەباتە بەر ئارام گرتن و نوێژ کردن . ئەگەر ئارامی نەبێ و ئارام نەگرێ هەرگیز ناتوانی نوێژەکان بەڕێك و پێکی و بەتەواوی ئەنجام بدا ، ئەوەش ئەرکێکی قورسە تەنها لەسەر شانی ئەوکەسانە نەبێت کەلە نێو نوێژەکانیان خاشعن و ئاگایان لە نوێژەکەیانەو دەزانن و لە نێوان هەردوو دەستەکانی خوا ڕاوەستاون و پیرۆزترین خواپەرستی ئەنجام دەدەن و لەناخی دڵیانەوە لە خوای خۆیان دەترسن ولەدواڕۆژێکی کورت بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە . کاتێ کەسەیری جولەکەو دیانەکان دەکەن و تەماشا دەکەن ئاینەکەیان هیچی لەسەر فەرز نەکردینەو بێ هەواو هەوەس و کەیفی خۆیان ناکەن ، ئاینی ئەوانیان پێ باشترە لە ئاینە پیرۆزەکەی ئیسلام ، جگە لەهەندێش دەڵێن جولەکەو دیان وەك ئێمە موسڵمانن و ئاینی ئەوانیش لەلایەن خواوە هاتووە بۆیان ، بێگومان

ئەو بیرو بۆچوونەیان دواپلەی نەزانی و کوێری و گومڕایان نیشان دەدا ، چونکە بێ خەبەرن لەو ڕاستیە پیرۆزە کەدەڵێ : (تەنهاو تەنها یەك خوا هەیەو ئاینیش یەك ئاینە کە ئاینی ئیسلامە) وەك دەفترموێ (إنَّ الدینَ عند اللّهِ الأسلامُ وما أختلف الذین أوتوا الکتاب إلا من بعد ماجاءَهم العلم بینهم ومن یکفر بآیاتِ الله فإنَّ الله سریعُ الحساب) (آل عمران١٩). ئەو بابەتەم لە نوسینێکی تایبەت بەدرێژی ڕوونکردیتەوە بەیارمەتی خوا.

١٠ – دەتوانم بڵێم لە گەورەترین هۆیەکانی ڕوودانی گەردە لوولەکانی ئەوروپا کە ڕووی ئەورووپای ڕۆژهەلاتی گۆڕی بۆ ڕوویەکی دیکە لە ساڵی (١٩٩٠) ولاتی یەکێتی سۆڤیەتی ڕوخاند کەلە گەورەترین دەوڵەتی سوپایی جیهان بوو لەدوای ئەمریکا ئاینە گۆڕدراوەکەی دیانان بوو ( ئینجیلە گۆڕدراوەکە یان بوو) .

دیسانەوە ئاین ڕۆڵ پایەو پلەی خۆی بەسەر مێژوو و خەڵکی دونیا سەپاندوو ڕۆڵێکی ئەرێنی (ایجابی ) بینی لە ڕووخانی گەورەترین پارت کە پارتی شیوعی بوو،پارتی کۆمەنیست لە هەموو ئەورووپای ڕۆژهەلات گەورەترین پەیمانی ڕوخاند ( پەیمانی وارشۆ ) هەروەها گەورەترین

دەوڵەتی عەسکەر تاریا کەولاتی یەکێتی سۆڤیەت بوو کە ژمارەیان شانزە دەوڵەت بۆ ماوەی حەفتاو سێ ساڵ حوکمی هەموو ئەورووپای ڕۆژهەلاتی کردو لەزۆر دەوڵەتانی جیهانیش دەستی درێژتر و جێگەی ترس و لەرز بوون لەنێو دەروونی هەموو حکومەتانی دونیا .

هەر لەیەکەم ڕۆژانی هەڵکردنی ئەو گەردە لوولە یەکەم دەزگا ئاینیەکان کەوتنەوە کارو دەرگای کەنیسەکان و مزگەوتەکانیش کرانەوە بەشێوەیەك هەموو دونیا زانی کە گەلانی جیهان چەند تامەزرۆی ئاینن و چەند خۆشحاڵ بوون بەڕووخانی هێزی ئیلحاد کە ماوەی حەفتاو سێ ساڵ بوو ئاینی قەدەغە کردبوو دەرگای کەنیسەکان و مزگەوتەکانی داخستبوو . ئەو گەردەلوولە ئیسپاتی کرد کە بیرو باوەڕی ئاینی شتێکی فترییە لەناو دڵ و دەروونی مرۆڤ بەلام هەموو کەس

ئەو توانایەی نیە لەو ئاینە ڕاستە بگەڕێ و بیدۆزێتەوە کە لەگەڵ فیترەتی دەگونجێ شان بەشانی دەڕوا (الا من رحم ربي) تەنها ئەو کەسەی کە خوای گەورە ڕەحمی پێ دەکا و هیدایەتی دەدا .

کاتێ کە گەردەلوولەکە گەیشتە ولاّتی ڕۆمانیای کۆمەنیست کە پیسترین و زۆردارترین تاغیە حوکمی دەکرد بەناوی (نیوکولا تشاوشیسکۆ) گەردەلوولەکە کەمێ هێواش بوو ، بەڵێ گەلی ڕۆمانی هەستا سەرپێ و بەرگی ترس و لەرزی لەبەر خۆی دادڕی وسوپای ڕۆمانی بەفەرمانی تاغیەکەی بەهەزارانی لێ گرت و کوشت و بریندار کرد ، بەلاّم کاتێ کە لە شاری (تیمسوارا) پەلاماری قەشەیەکیان دا گرتیان بەیەکجاری بارو دۆخەکە لە دژی تشاوشیسکۆ تەقیەوەو بەچەند ڕۆژێکی کەم تشاوشیسکۆ و ژنەکەی دەسگیرکران و بەخێرایی گوللە باران کران .

تا قەشەکە نەگیرا لەلایەن جەلادەکانی تشاوشیسکۆ بارو دۆخەکە بەوشێوەیە نەتەقیەوە کە ئەو تاغیە لەناوبات کەچی کەدەست درێژی کرا سەر پیاوێکی ئاینی نەسارا لە شاری ناوبراو یەکسەر بارودۆخەکە تەقیەوەو هەموو شتی کۆتایی پێهێنرا کۆمەنیست و ڕژێمی کۆمەنیستیان لەو ولاّتە (ڕۆمانیا ) گۆڕ بە گۆڕ کرد ، سەیری کاریگەری ئاین لە هەموو بارودۆخێك کوشتن و گرتن و بریندار کردنی هەزاران کەس یەکسان نەبوو بەسەلامەتی یەك تاکە قەشە تای تەرازوی قەشەکە گەلێ قورستر بوو لە هەر هەموو کوژراو و بریندارو گیراوەکانی ئەو ولاّتە لەلایەن جەلادەکانی تشاوشیسکۆ .

کەواتە ڕۆڵی ئەرێتی ئاین گاڵتەی پێ ناکرێ لە گۆڕانی هەموو بارودۆخەکانی ژیان لەهەموو کات و سات و شوێنێك بە درێژایی مێژوو ، کەواتە چۆن دەبێ ئێمەی موسڵمانی کورد بەکوێری و بەنەزانی خۆ بخزێنینە نێو ئەو شەوە زەنگەی کە گوایا ئاینی ئیسلامی پیرۆز کوردی دواخستووە !!

١١ – دەوڵەتی پۆڵەندا بەدرێژایی مێژووی خۆی لە ئەورووپا پێنج جار لەسەر نەخشەی ئەورووپا ڕەش کراوەتەوە لە لایەن داگیرکەرانی دەوروبەری، بەلاّم

هەر پێنج جار کەنیسەی پۆڵەندی توانیویەتی ئەو دەوڵەتە زیندووکاتەوەو بیگەڕێنێتەوە سەر نەخشەی ئەورووپاو جیهان .

کام پارتی دەستکرد توانیویەتی لە هەموو جیهان بەو شاکارە هەستێ پێنج جار وڵاتەکەی لەسەر نەخشە ڕەش بکرێتەوە و هەستی بەزیندوو کردنەوەی ؟ کەواتە دینداری بنەڕەتی نیشتمان پەروەریەو نیشتمان پەروەری نەك لەبیر مرۆڤ ناباتەوە ، بەڵکو بەهێزی دەکاو هیچ ئاینێك نییە لە دنیا بەباوەرهێنەرەکانی گوتبی و داوای لێکردبن کە خیانەت بکەن و گەل و نیشتمانی خۆیان بفرۆشن هەرچەندە ئەو ئاینە گۆڕدراو و بێ کەڵك بێ، ئایینە گۆڕدراوەکەی دیانان داوا لە کۆیلە دەکا کە بەندایەتی ئاغەکانیان بکەن و مل کەچی فەرمانەکانیان بن و زیاتر

بۆیان بچەوسێنەوە، چونکە خوای گەورە ئێوەی بۆ خزمەت و کۆیلایەتی ئەوان دروست کردیە ( پەنا بەخوا ) بەڵام لە هەموو ئاینەکەیان دانیە کە داوا لە هاوڵاتیان بکا خۆیان و گەل و نیشتمانەکەیان بفرۆشن .

١٢ – تەنها ئیسلامە مایەی ئاشتی یە، ئەوەی لەو خاڵە بۆت دەنووسم هەمووم بەچاوی خۆم دیووەو شان بەشانی ژیاوم و لەگەڵ هۆش و بیرم جۆشی خواردووەو هەرگیز لەبیری ناکەم هەتا دەمرم هەمیشە مایەی ئاخ و ئۆف و ئێش و ئازاری دڵ و دەروونمە .

تەمەنم تەنها دەساڵێك دەبو و، ساڵی ١٩٥٨ لە پۆلی چوارەمی سەرەتایی دەرچوو بووم بۆ پێنج ،لە پشووی هاوینە دابووین ، مامم پینەدۆز بوو منیش شاگردی بووم ، بەیانیان دەبایە زوو بچمە دوکانەکەی و شەربەیەکی ئاوی هەبوو دەبوایە ئەو شەربەیەی بۆ پڕ ئاوی خواردنەوە بکەم و پێشی دوکانەکەی بۆ بڕشێنم و یەك دوو مەسینە ئاویشی بۆ (تەغاراوەکەی) بۆ نەرم کردنەوەی (سەختیان) بۆ بهێنم ، بەر لەوەی بازاڕ بەتەواوی بکرێتەوە.

ڕۆژی چواردەی تەمموز بوو ، کاتژمێر شەش یا کەمێ زیاتر بوو، ساڵەکە وەکو گوتم ساڵی (١٩٥٨) مامم لە پێش دوکانەکە دانیشتبوو منیش خەریکی ڕشاندنی پێش دوکانەکە بووم . لەو کاتەدا چەند برادەرێکی مامم هاتن و فسکەیەکیان بەبن گوێی مامدا چرپاند ، منیش گوورتم مامە ئەو برادەرانەت ( کاك فلان و کاك فلان ) چیان پێ گووتی، ئەویش لە وەلاما بەخەندەیەکەوە گوتی: وس وسکت بە چ نیە ، ئیتر هێندەی نەبرد بوو بەهەڵڵاو بەزم و ڕەزمێکی یەکجار سەر سوڕهێنەر ، چیەو چ بووە ، الحمد لله شۆڕش ( پورە ) کرایە لەبەغدا و حوکمی نوری سەعید و مەلیك فەیسەلی دووەم تەفرو تونا کرا ، بەلاَم بەداخەوە جارێ

(نوری سەعید) سەرۆك وەزیران نەگیراوەو هەلاَتووە بەلاَم (عبدالالـە) ی وەصی مەلیك فەیسەل و هەروەها مەلیك فەیسەل بۆخۆی کوژراون، الحمد لله تێکڕای خەڵك وایان دەگووت بەرپەری خۆشحاڵی و خۆشیەوە نیزامی حوکم ( نظام الحكم )لەعێراق لەمەلەکی ( پاشایەتی ) بوو بە جەمبوری ( جمهوری ) عیراق لەژێر چەپۆکی داگیرکەرانی ئینگلیز ئازاد کرا لەسەر دەستی زەعیم ( عبدالكريم قاسم) کە ئەفسەرێکی سوپای عێراق بوو .

دوای دوو ڕۆژ یا سێ ڕۆژ (نوری سەعید) سەرۆك وەزیران بەبەرگی ژنان و بەعەباو پێچە دەستگیرکرا لە ناوەندی شاری بەغدا ، لەوکاتە کەدەیویست خۆی لەدەست دڕندەکانی بەغدا ڕزگار کا، ئیتر هەر هێندە کەوتە بەردەستیان ئێستاش کەس نەیزانی چی لێ بەسەر هات بەزیندووی پارچە پارچە کراو هەر پارچەی لە شوێنێك بەجێ ما ، دوای ئەوەی کە بە ئۆتۆمبیل ڕاکێشرا لەسەر شەقامەکانی شاری بەغدا، شایانی باسە (نوری سەعید) هەرگیز ئەو تاوانبارە نەبور کەشایەنی ئەو جۆرە کوشتن و برینە بکرێ و پارچە پارچە بکرێ و کەس نەزانی پارچەکانی چیان لێ بەسەر هات، هەروەها مەلیك فەیسەڵی دووەمیش کەتەنها تەمەنی پانزە ساڵێك بوو بەناهەق کوژراو لەناو چوو .

تاکو ئەمڕۆش پیاوە ناودار و گەورەو خاوەن ویژدانەکانی بەغدا پارچە پارچە کردنی نوری سەعید لەبیر ناکەن، تاکو ئەمڕۆش جار جارە لەسەر کەناڵە ئاسمانیەکانی وەك (الجزيرة و العربية، المستقلة) دەیڵێن و دەیلێنەوە کە بەچ ڕێگەیەکی دوور لە هەموو کێشانەو پێوانەی مرۆڤایەتی ئەو کەڵە پیاوە پارچە پارچە کرا بە زیندوویی و هەرقاچەی لەسەیارەیەك بەستراو دواتر سەیارەکان بەدوا پلەی خێراییان کردیان بە دوو پارچەو ئەوجا خوا نەبێ کەس نازانی بەچ ئازارێك گیانی لەدەست داو لەناوبرا.

من بەش بەحاڵی خۆم کە زێدە مناڵ بووم و خاوەنی هیچ جۆرە تەجروبەیەکی ژیان نەبووم تەنها دوای سێ ساڵ زانیم کە نوری سەعید زۆر چاکتر بوو لە عبدالکريم قاسم و ڕژێمی پاشایەتی گەلێ چاتر بوو لە ڕژێمی کۆماری. چۆنم زانی؟ با بۆت باس بکەم؟: لەسەردەمی پاشایەتی (مامم) کە لەجێی باوکم بوو ڕۆژێ لە ڕۆژان نەم دی کەسێ بەهۆی سیاسی و حیزبایەتی نارەحەتی بکا، بەڵام لە ژێر سایەی ڕژێمی کۆماری سەیرم کرد زۆر نارەحەتەو تەنانەت کۆمەڵێك لە کۆمەنیستەکانی (کۆیە) شەوێك لە شەوان ڕێیان پێ گرت و گەلێکیان لێ دا تەنها لەسەر ئەوە کە کۆمەنیست نەبوو، ئەوحاڵەتەش تەنها بەسەر مام نەهاتبوو ، بەڵکو شتێکی شەوانەبوو تاماوەیەك. تەنانەت من خۆم مناڵێکی هەتیوو بووم لەگەڵ ئەوەشا لە قوتابخانەکەم تەواوێك لەدەست مامۆستاو قوتابییە کۆمەنیستەکان دووچاری نارەحەتی بووبووم زۆر جاران بەناحەق لێیان دەدام و دەستم دەکرد بەگریان، تا ئێرە ئەوە پێشەکی ئەو خاڵەی دواییە، لێرە بەولاوە دێمە ناوەرۆکەکەی:

چاکم لەبیرە ولاتی عێراق تا ڕۆژی (١٣ / تەموزی / ١٩٥٨) تابڵێی وڵاتێکی خۆش و ئەمین بوو . ئاسایش لەباکورو باشوورو ڕۆژهەلات و ڕۆژ ئاوا بەرقەرار بوو ئاینی ئیسلام باڵی بەسەر وڵات کێشابوو، باب و ئەولادەت و دایك و ئەولادەتی بەهێز بوو خزمایەتی و دراوسێیەتی و دۆست و برایەتی بەنیسبەت ڕۆژگاری ئەمرۆ یەکجار بەهێز بوو .

لەنێو دام و دەزگاکانی میری یاسار عەدالەت تەواو کاریان پێدەکراو لە کۆلیج و زانکۆکانی عێراق لەشاری بەغدا حەق و عەدالەت ڕەچاو دەکراو تا ڕادەیەکی زۆر کاریان پێ دەکراو جیاوازی لە نێوان کورد و عەرەب و تورکمان نەدەکرا ، کام قوتابی نمرەی باش و زۆری هێنابا لە ئەزموونەکانی بەکەلۆریا بەبێ کێشە قەبوڵ دەکرا ، دوای دەرچوونیشی
بەپێی پێویستی وڵات و بەگویرەی جۆری شەهادە لە دام و دەزگاکانی میری قەبوڵ دەکرا ، برایەتی کورد و عەرەب یەکجار بەهێز بوو ئەوتا شاعیری کورد (بێکەس ) دەڵێ:

**برایەتی کورد و عەرەب زۆر کۆنە تاریخ شاهیدە**
**ناحەزی ڕوو ڕەش لەداخا با یەخەی خۆی دادڕێ**

بێ گومان ئەو برایەتیە برایەتیەکی ئیسلامی بوو واتا ئاینی پیرۆزی ئیسلام دروستی کردبوو ئێمەی کورد لە نێو براعەرەبەکان ڕێزو نرخمان زۆر بوو ، هەروەها ئەوانیش لە نێو ئێمە هەروا بوون ، هەزاران بازرگانی کورد کە بازرگانی لەگەڵ بازرگانەکانی عەرەب هەبوو لەشاری بەغدا یا موصل یا بەصرە زۆر باوەڕ پێکراو بوون و بەبێ حیساب کوتال و کەل و پەلیان پێ دەفرۆشتن بەقەرز و لە جەژنەکانی قوربان و ڕەمەزان لە ڕێگەی (برید) کارتی جەژنە پیرۆزەیان دەگۆڕیەوە و دەچوونە سەر پرسەی یەکتری ، خۆشەویستیەکی بێ تەماح و موسڵمانانە لە نێوانمان خۆی سەپاندبوو ، ئەوسەرو ئەوسەری عێراقت کردابا خاڵێکی پشکنینت لەسەر ڕێگاکان چاو پێ نەدەکەوت ، دواتر تەنها نێوان کۆیەو هەولێر کە تەنها حەفتا کیلۆمەترێکە ، چوار تا پێنج خاڵی پشکنینی تێدابوو کە بریتی بوو لە چەندان سەرباز و پیاوی ئەمن و ئیستخباراتی حکومەتەکانی دوای حکومەتی پاشایەتی لە عێراق کە ئەوانیش بۆ خزمەتی وڵات وەك فەرمانبەر نەقلی کوردستان کرابوون ، بێگومان هەزاران خێزانی کوردیش لەهەمان کات لە شارەکانی ناوەندوو باشوری عێراق هەبوون، بەتایبەت لە شاری بەغدای پایتەخت .

ڕاسته هەژاری و دەست کورتی له هەموو عێراق بەگشتی و له کوردستان بەتایبەتی دیاردەیەکی ئاشکراو بەرچاو بوو، بەلاّم خەلّك به هەژاری خۆی شوکر بوو، لەگەلّ ئەوەشا دزی و جەردەیی یەکجار کەم بوو دەتوانم بلّێم کوشتن هەر نەبوو لەبەر ئەوە خەلك یەکجار لەخوا دەترسان و کوشتنی پێ کوفور بوو دلّی هەموو کەسی دەلەرزاند ، بەتێکڕا خەلّك خەریکی کار و کەسابەت و مالّ و منالّ بەخێوکردن بوو، کەس تەماحی لەمالّ و ناموس و ئابڕوی کەس نەدەکرد ، بێ گومان ئەوەش هەر لەبەر ئیسلامەتی بوو کە هێشتان هێز و کاریگەریەکی زۆری لەسەر خەلّك مابوو .

ئاستی زانیاری له هەموو قۆناغەکانی خوێندن (سەرەتایی تا زانکۆکان) بەنیسبەت ئەوڕۆمان یەکجار بەرز بوو ، مامۆستای سەرەتایی ئەو کات کە لە دوای دەرچوونی له پۆلی شەشی سەرەتایی دوای ئەوەی شەش مانگ لەبەغدا دەورەیەکی تەواو دەکرد دەبوون به مامۆستا ، ئێستاکە لەژیان مابان بەهاسان دەیان توانی وانه له زانکۆکانی ئەوڕۆ بلّێنەوە ، وادەزانم ئاستی زانین و زانیاریان گەلێ له ئوستادەکانی زانکۆکانی ئەوڕۆ بەرزتر بوو ئەگەر نەلّێم له هەموویان دەلّێم له زۆربەیان .

وانەی ئاین ( ئاینی ئیسلام ) وانەیەکی سەرەکی له قوتابخانەکانی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی ، زانیاری ئاینی زۆر به سوودمان دەخوێند ، بەپەروەردەیەکی ئیسلامی پەروەردەیان دەکردین، فێری ڕەوشتە جوانەکانی ئیسلامیان دەکردین وەك ڕاستگۆیی و درۆ نەکردن و دەست ئەمینی و چاکە دانەوەی دایك و باوك و شان بەشانی هەموو عیبادەتەکان (شەهادە ، نوێژ، ڕۆژو، زەکات، حەج ) .

باری کۆمەلاّیەتیمان و پەیوەندیە کۆمەلاّیەتیەکانمان ( له چاو ئەوڕۆ) یەکجار بەهێز بوو، وەك دایك و ئەولادەتی و باوك و ئەولادەتی و خزمایەتی و دراوسێیەتی و دۆست و برادەرایەتی ، ژن هێنان و کچ بەمێردان یەکجار هاسان تر بوو لەوڕۆ هەر کوڕێ بیویستبا ژن بهێنێ ئەو

کوڕە بەهاسان ژنی دەست دەکەوت کە مادام موسڵمان و ڕەوشت بەرز باو سنعاتێکی زانیبا، لەناو کوردەواری سنعاتکار زۆر لە باو بوو خەڵك دەیانگووت فلاَن سنعاتکارە بازنی زێڕی لە دەستە و خەڵك رکیان لە کەسانی تەمەڵ و تەوەزەل دەبۆوە .

لە سایەی ئیسلامی پیرۆز فرتو فێڵ و سەختە و ڕیباخواردن زۆر کەم بوو، لەبەر ئەوەی خەڵکەکە لە خوا دەترسا ، دوکانداری وا هەبوو ئەگەر بمردبا لەبرسان لە موعامەلەکردن درۆی نەدەکرد .

با لەوە زیاتر درێژەی پێ نەدەم لەهەموو بارو بوارو لایەنەکانی ژیان بەگشتی لە ئەوڕۆ چاکتر بووین ئەو حاڵە بەردەوام بوو تا ڕۆژی (١٣ / ٧ / ١٩٥٨) واتا ڕۆژێك بەر لەوەی (عبدالکریم قاسم) ڕژێمی پاشایەتی بە کۆدەتایەکی سەربازی ( انقلاب عسکری ) لەناو ببات .

هەر لەدوای ئەو کۆدەتایەی عبدالکریم ، بەشێوەیەکی یەکجار خێرا و سەر سوڕهێنەر ئایینی ئیسلامی پیرۆز یەکسەر بەرەو کزی ڕۆیی و حزب و حیزبایەتی جێی گرتەوە ، بەر لەو کودەتایە واتا ڕۆژی (١٣ / ٧ / ١٩٥٨) لە هەرکەسێکت پرسیبا تۆ چی؟ لەوانەبوو پرسیارەکەتی زۆر بەلاوە سەیربا و لە وەلاَما پێی دەگووتی: کاکە مەگەر نازانی من موسڵمانم و کوردم . ئەو پرسیارە سەیرە چیە تۆ لەمنی دەکەی؟ مەگەر گاڵتەم پێ دەکەی ، بەلاَم لەدوای ئەو کۆدەتایەو گۆڕانی ڕژێمی پاشایەتی بۆکۆماری ، یەکسەر هەموو کێشانە و پێوانەیەك گۆڕا یەکسەر خاکی عیراق بوو بە گۆڕەپانی جۆرەها پارتی عەلمانی ( احزاب علمانیة ) گەلانی عێراق بەشێوەیەکی تۆماتیکی یەکجار سەیر دابەش بوون بەسەر ئەو حیزبانە ،حیزبایەتی عیلمانی بەخێراییەکی یەکجار سەر سوڕهێنەر جێگەی ئیسلامی پیرۆزی گرتەوە ئاینی ئیسلام کەوەك دوای تەسبیح هەموو گەلانی عێراقی لەسەر یەك داو هۆندبۆوە، داوەکە لەسەر بەرزترین لووتکە چیای بەلاَو موسیبەت پساندراو هەر دنکەی کەوتە لایەك، ناکۆکی و ناتەبایی جێگەی یەکگرتن و تەبایی گرتەوە . هەموو پەیوەندیە

کۆمەلآیەتیەکان پچڕان شەڕو پێکدادان بوو بەکارو پیشەی ڕۆژانەی خەڵك، دۆست و برادەرایەتی ئیسلامی بوو بە دۆست و برادەرایەتی حیزبایەتی . حقدو کینەو دوژمنایەتی وەك نەخۆشی خروکەو تاعون باڵی بەسەر ولآت دا هەلکێشا ، چاکم لەبیرە لەناو یەك تاکە خێزان چەند بیرو ڕای حیزبایەتی عەلمانی تێکەوتبوو ، ئەندامی ئەو خێزانانە کە خوای گەورە ڕۆژی بەحەقی دەکردەوە بەر لە هەموو شتێ بەو بەیانی سالحان تێك بەردەبوون و لەبری سەلام کردن لەیەك جوێن و پەللاری ناشیرینیان ئاراستەی یەك دەکرد ، کە بێگومان بەر لە هەندێ ئاینی ئیسلامی پیرۆز کەش و ئاو و هەوایەکی برایانەو خۆشەویستانە لە نێوان دروست کردبوون ئەو کەش و هەوایەش تووشی کودەتای عەلمانیەت بوو و ئەویش لەناو چوو .

ئیتر هەندەی نەبرد کوشت و کوشتار و خوێن ڕشتن کەوتە گۆڕ ئیسلام و خواپەرستی لەبیر زۆربەی گەلانی عیراق چۆوە و عەلمانیەتێکی کوێرانەی بێ ڕەحمانەی دوور لە هەموو تاستێکی مرۆڤایەتی جێگەی گرتەوە، کوشتنی یەك یەکە گەشەی کرد بۆ کوشتنی بە کۆمەڵ ، مۆری پەنجەی ئیسلام لەسەر سەندو کاغەزی هەموو بارو بوارەکانی ئیسلامی ڕەشکرایەوە و یاسای دارستانە چڕە پڕ درندەکان جێگەی دەستوور و یاسای ئیسلامی گرتەوە، ئاشتی و ئاسایش بەخێرایی بەرەو کزی ڕۆیشتن تا وای لێ هات کەس لە خۆی و لە گیانی خۆی و ماڵ و منالّ و ئابڕوی ئەمین نەبوو هەر هەمووی کەوتە مەترسیەوە .

ئەو باس و خواسە هەرگیز بەچەند لاپەڕەیەك نووسینی کەم نایەتە کاسە ، ئەوەی کە ئاینی ئیسلامی پیرۆز لەو عێراقەدا بەزیاتر لە هەزار ساڵ درووستی کردبوو بەکەمتر لە هەزار سەعات لەناو چوو، ئەوجا لەگەڵ ئەوەشا برادەرانی مۆدێرنی ئەورۆ ناویان لەو هەموو وێرانکاریەی کە ئەو کۆدەتایە دروستی کرد ناویان نا ڕۆژگاری پێشکەوتن و پێشکەوتن خوازی ، ناویان نا ڕۆژانی ئازادیخوازی و ئازادیخوازان .

چەند شتێکی یەکجار سەیرە ، چەند تاوانێکی گەورەیە ، دوێنێی ئاشتی و ئاسایش و برایەتی و خۆشەویستی و تەبایی لە ژێر سایەی ئیسلامێکی پیرۆز کە لە هەر شوێنێ و لەهەر کاتێ بلاو بێتەوە تەنها کاری دروست کردنی ئاشتی و ئاسایش و برایەتی و خۆشەویستی یە لەگەڵ ئەوەشا پێی بگوترێ دواکەوتن و کۆنە پەرستی . بەو هەمووە فیتنەو خوێن رشتنی دەیان هەزار بەلکو سەدان هەزار بێ تاوان و تێکچوونی هەموو بارو بوارەکانی ژیانیش پێی بگوترێ پێشکەوتن و پێشکەوتن خوازی و ئازادی و ئازادی خوازی .

بەکورتی تا کەمێ ئاینی ئیسلام لەو عێراقەدا بالی هەلکێشابوو بەسەر گەلانی عێراق تا بلێی بارو دۆخی ئاسایی بوو ، بەلام کاتێ بەهۆی ئەو کودەتا بەدوومەی عبدالکریم قاسم پەری ئەو بالە هەلوەری هەموو شتێك تێك چوو ، یەکسەر شەرو فیتنەو کوشتن و برین جێگەی گرتەوە و رۆژ بەرۆژیش لەپەرەسەندن دایە ئەمرۆش لە هەموو رۆژانی رابردوو خراپترە ، بەس نییە ئەوجا بەئاینی ئیسلام بلێن ئاینی کۆنەپەرستان و هۆی دواکەوتن بەکوفرو ئیلحادیش ، کە ئەورۆ جۆرەها ناوی بریقەدارییان ناو نایە بەرنامەی ئاشتی و ئاسایش ، هۆکاری گەشەکردن و پێشکەوتن؟ هەرگیزاو هەرگیز لەبیری ناکەم و وادەزانم هەزارانی وەك منیش لەبیری ناکەن کەچەند ئاسوودەو دلنیا بووین لە پەنا ئیسلام و لە ژێر سێبەری (لا إله إلا الله محمد رسول الله )کەبەرەو کزیش چوو بە دەستی هێزەکانی جەهل و کوفرو ئیلحاد خۆمان لە کوێ دۆزیەوە ؟

١٣ - با راستیەکی مێژوویی دیکەماوە بەکورتی ئیشارەتی بۆ بکەین: دەولەتی عوسمانی نزیکەی پێنج سەد سال حوکمرانی تورکیاو هەموو ولاتانی رۆژهەلاتی ئیسلام کرد ، بەناوی ئیسلام . راستە گەلی موسلمانی کورد دووچاری زولم و ستەمێکی زۆر بۆوە لەژێر دەستی ئەو دەولەتەی عوسمانی ، بەلام نابێ ئەوەش لەبیر کەین کە هەندێ جار خۆمان دەبووینە هۆی ئەو زولم و ستەم کاریە ، بەهۆی ئەو خۆخۆریەی بەدرێژایی مێژوو بەسەرماندا رژاوەو کراسێکی ئاگرینە پر بەقەدی ئێمە براپە ، هۆی هەرە گەورەی هەر بەلاو موسیبەتێکە کە بەسەرمان

هاتووه، کاتێ ئەو دەوڵەتە ڕووخاو تێکشکا لە جەنگی جیهانی یەکەم لە ساڵی ۱۹۱۸ دوای ماوەیەکی کەم دەوڵەتی خیلافەت بەناوی ئیسلام نەما گۆڕا بووبە دەوڵەتێکی عەلمانی بە سەرکردایەتی (ئەتا تورکی مولحید = کەمال ئەتا تورك ) یاخود گورگە بۆر (الذئب الاغبر) کە ناوی ڕاستی (مستەفا کەمال) وشەی (ئەتاتورك) مانای باوك واتا باوکی تورك (مستەفا ئەتا تورك ) ، دام و دەزگاکانی کوفرو ئیلحاد ئەو ناوەیان بۆ دۆزیەوە بەو ناوەی کە تورکی ڕزگار کردیە لە کۆنەپەرستی و دواکەوتن بەهەر حاڵ ئەو ئەتا تورکە لە (۱۵ / ۳ / ۱۹۲۵) دەستی کرد بە کورد کوشتن ، وەك بەڕێز ( مام جەلال تالەبانی) لە کیتابەکەی بەناونیشانی (کردستان والحرکە التحرریە الکردیە) تەبعەی دووەم ساڵی ۱۹۷۰ بەماوەی سێ مانگ زیاتر لە نیو ملیۆن کوردی بێ گوناهی کوشت و هەزاران گوندی کوردستانی بە شۆڤڵی ئەمریکی خاپور کردو لەگەڵ زەوی جووتی کردوو بەچەندان هەزاریشی لێ گواستەوە ئەنقەرەو ئەستەنبوڵ و شارە تورك نشینەکان .

مەبەستم لەم کورتە باسە ڕاست و نزیکە ئەوەیە: ئەوەی کە ڕژێمی عوسمانی بە ماوەی پێنج سەد ساڵ پێی کردین کە بەناوی ئیسلام حوکمی دەکرد ڕژێمی عەلمانی ئەتاتورکی تاوانبار بەماوەی سێ مانگ سەد ئەوەندەی زیاتر پێ کردین؟! لێرەدا دەبێ چاك بزانین کە ڕژێمی بەناو ئیسلام تەنها بەناو ئیسلام چەندان جار چاکترە لەهەر ڕژێمێکی عەلمانی دوور لە ئیسلام و لەبەر خاترو گەورەیی ناوەکە شتێکی بۆمان تێدا دەهێلێیتەوە ، بەلاّم ڕژێمە عەلمانیەکان پەڕۆی لەبەر دەردەهێنی و هیچ شتێك نیە لەخوێن ڕشتنی بوەستێنێ .

هیچ گومانی تێدا نیە و ڕاستیەکە لەبەرچاوی هەمووماندایە زۆربەمان دیومانە ئەوەتەی ڕژێمی عەلمانیەت ، ڕژێمی کوفرو ئیلحاد و دوور لە ئیسلام ، کەوتۆتە نێو وولاّتانی ڕۆژهەلاّتی ئیسلام بەتایبەت ئەو وولاّتانەی کە کوردیان لە ژێر چەپۆکە ، لەسەرەتای سەدەی بیستەم تاکو ئەمڕۆ، ئەوڕۆش لە هەموو کاتێك زیاتر ژیانی گەلی موسڵمانی کوردمان بەیەکجارەکی کەوتیتە مەترسی و لەناو

چوون ، هەرگیز ئەو ترسەی کە ئەورۆ هەڕەشەی لەناوبردنمان لێ دەکا لەسالأن و سەدەکانی ڕابردوو دووچاری نەدەبووین، بەهۆی ئەو ئیسلامەتیەی کە خوای گەورە پێی بەخشی بووین .

١٤ – وا لە پێش چاومانە بەدەیان گەلی موسڵمان لەسەر ئەرزی خوا هەیە هەرهەموشیان خاوەنی دەولەتی سەربەخۆن ، بۆچی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەولەتی لەکیس ئەو هەموو دەولەتانە نەدایە بەتەنها لەکیس ئێمەی دایە ئاخۆ ئێمە بەسەهوو چووینە؟ یا ( أعوذ بالله ) ئیسلام بەتەنها ستەمی لە ئێمە کردیە؟ پەنام بەخوا کە من بیرو بۆچوونم وابێ ئایینی ئیسلام ستەمکار کەم ڕۆژێ لە ڕۆژان یا لەبەر هەر هۆیەك بێگومان هیچ هۆیەك نیە لەسەر ئەرز بتوانی ئاینی ئیسلامی پیرۆز

تاوانبار کا تەنانەت هەوار هەوەس و پەی پێ بردنی شەیتان نەبێ ، تەنانەت دوژمنانی ئیسلام بەو تاوانە هەڵدەستێت ، چونکە ئەو ئایینە لەهەموو هەڵەو خوارو خێچیەك لەهەموو کەم و کوڕیەك دوورە لەبەر ئەوەی لەلایەن خالیقی گەردوون و بوونەوەر لە نەبوو هاتووە بۆ ڕۆناك کردنەوەی زەوی و ئازاد کردنی مرۆڤ لەتاریکیەکان بۆ ڕووناکی خوا .

لەهەمان کاتدا چەندان گەلی موشریك و بوت پەرستیش هەنە کە تا ئێستا خاوەن دەولەتی سەربەخۆیی نین و یەکجاریش دواکەوتوون ، ئەی ئەو گەلانە خۆ موسڵمان نین تا بلێین ئیسلام پەکی دروست کردنی دەولەتی خستوون ئەی کەواتە چ هۆیەك لەژێر چەپۆکی و ماڵ وێرانی هێشتوونەتەوە؟ وەك گەلی کوردی باشوور کە تا ئێستا قەلەم ڕەوی ( مستعمرة ) ئەمریکایە هەروەها گەلی (تبت) لەچین وە تایوان ، ئیرلەندای باکوور... هتد تا ئەمرۆ جوولەیان نیە، بیریان لە ڕزگاری خۆیان نەکردیتەوە ، بەلأم ئەو گەلە موسڵمانانەی کە ژێردەستن ساتێ لەشۆڕش و شۆڕشگێڕی نەوەستاین ، چونکە ئاینیان ئیسلامەو تاکە هاندەریشیان بۆ هەموو دونیا ڕۆن بۆتەوە کە موسڵمان ژێردەستی قەبول ناکا وەك گەلی فەلەستین و گەلی کەشمیر و موسڵمانانی فلیپین و گەلی ئەفغانستان و گەلی صۆماڵ .

١٥ - كەس نیە لە دونیا ئەو ڕاستیە نەزانی کە داگیرکەرانی ئەورووپی و ئەمریکی هەروڵاتێکیان داگیر کردبێ یا داگیرکەن یەکسەر هەوڵی بەبەند کردنی گەلانی ئەو وڵاتانە دەدەن بەهەموو شێوەیەك و ڕێگەیەکی نامرۆڤانەو دڕندانەوە پەنا بۆ هەموو فرتو فێلێك دەبەن تا بە ئاوات بگەن ، زۆر بە شێوەیەکی دڕندانەو میگافیلیانە هەڵس و کەوت لەبەرامبەر گەلی داگیرکراو دەکەن، یەکەم هەوڵ و دوا هەوڵیان ئەوەیە کە هەرشتێك لە نێو ئەو گەلە کە هۆکاری پێشکەوتنیەتی و هۆکاری ئازادی و ڕزگار بوونە ، هۆکاری سەر بلندی و زانیاری و زانینە ، هۆکاری شۆڕش و شۆڕشگێڕایەتیە ، هۆکاری دەوڵەمەندی و بەختیاری و کامەرانییە لەناوی دەبات بۆ ئەوەی گشت ڕۆڵەکانی بکا بەجۆرە گیانلەبەرێك کە لەبن دەستوو پێیان بفلیقێتەوە یا بەفووی زاری بۆگەنیان با بیانبات ، ئەوە سروشت و سیفەتی داگیر کەرانە لەوەتی خوای گەورە گەلانی دروست کردیە لەسەر زەوی .

چوار جۆرە داگیرکەر هەنە: (داگیرکەر لە پێناوی ئابووری، داگیرکەر لە پێناو لەشکری ، داگیرکەر لەپێناو نەهێشتنی ئاینی گەلی داگیرکراو ، داگیەرکەر لە پێناو نەهێشتنی زمانی گەلە داگیرکراوەکە ، بەلآم من دەڵێم نەخێر هەموو داگیرکەرێك هەر چوار ئامانجی لە داگیرکردن هەیەو جیاوازیان لەنێوان ناکەم .

لێرەدا ئەو پرسیارە دەکەم: ئەگەر ئاینی ئیسلامی پیرۆز هۆی دواکەوتن و شەرمەزاریە بۆچی هێزە داگیرکەرەکانی کوفر و ئیلحاد بەر لە هەموو شتێ لە وڵاتانی ئیسلامی داگیرکراو بەهەر هەموو هێزو توانای کە هەیتیان، بەهەر فرت و فێلێك کە پەی پێ دەبەن و بیریان بۆ دەچێ هەوڵ و کۆشش بۆ لەناو بردنی ئەو ئاینە دەدەن ؟ تەنانەت زۆر جارانیش هەوڵ و کۆششەکانیان بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانە گەلێ بەزۆر لەسەریان دەوەستێ و زیانی گیانی و ماڵی و لەشکری و ڕامیاری زۆریان پێ دەگات ؟ بێ گومان ئەو گەرم و گوڕیە و خەرجیەی کە دەیخەنە گەڕبۆ لەناوبردنی ئاینەکەمان گەورەترین بەڵگەیە لەسەر پیرۆزی و پاکی ڕاستی ئەو ئاینە کە ئیسلامە، هەموومان دەزانین هێزەکانی کوفرو ئیلحاد وا سەدان ساڵە خەریکی لەناوبردنی ئەو ئاینە پیرۆزەن ، چونکە زۆر چاك دەزانن

بەعیلم و بەعەقڵ و بەواقیع کەبەردەوامی و مانی ئەو ئاینەو ڕاوەستانی بە پێوە گەورەترین هۆکاری پێشکەوتنی گەلانی موسڵمانە، گەورەترین هۆکاری هێز و دەسەڵات و زانیاری و سەرفیرازیە بۆ هەمووگەلانی موسڵمان، چونکە دەزانن بەبێ شك هەر ڕۆژێکی گەلانی ئیسلام بەتەواوی یا نیمچە تەواو گەڕانەوە سەر ئەو ئاینەو دەستیان پێوە گرت ئیتر جێ پێیەك بۆ ئەوان نامێنێتەوە لە هەموو دونیای ئیسلام ، ئەوەیە کەهەموو خێرو تواناو ماڵ و گیان و گشت تەکنەلۆجیای کە تائێستا پێی ڕاگەیون خستۆتە گەڕ بە بەردەوامی بۆ لەناو بردنی . زۆر چاك دەزانن ئەوەی کە لەو ئاینە پیرۆزە ئەوان دەیزانن ئێمە نایزانین لەوە دەترسن ڕۆژێ لە ڕۆژان وەك ئەوان لە ئاینەکەمان بگەین و بەخێرایی بگەڕێنەوە سەری و ئەوان پەکیان بکەوێ و جارێکی تر نەتوانن گەورەکانیش بەسەردان بێنە ولاتانی ئیسلام شتێکی چەند غەریبە میوان لە خاوەن ماڵ شارەزایی پتری هەبێ . ئەوە ئێمەی موسڵمانین .

سوێند دەخۆم بەخوای گەورە و سەد جاریش هێزەکانی کوفرو ئیلحاد ئەگەر بیانزانیبا کە ئاینی ئیسلام هۆی دواکەوتن و ژێر چەپۆکی جیهانی ئیسلامە هەرگیزاو هرگیز نەك هەوڵی لەناوبردنیان نەدەدا ، بەڵکو ڕۆژ بە ڕۆژ بەهێزتریان دەکرد ،چونکە ئەوان هەموو ولاتێکی داگیری دەکەن بەدوا ئەو هۆکارانە دەگەڕێن کە ئەو ولاتە دوادەخاو بەرەو دواوەی دەگەڕێنتەوە و ئەو هۆکارانە بەهێز دەکەن ، لەهەمان کات بەدوا ئەو هۆکارانەش دا دەگەڕێن کە ولاتی داگیرکراو بەرەو ڕزگاری و بەرەو پێشکەوتن دەباو لەناویان دەبەن بەهەر نرخێك بێ ، ئەوە یەك لە سروشتە هەرە گەورەکانی هێزەکانی کوفر و ئیلحادە .

مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە لەسەردەمی (صلاح الدین) خوا لێی خۆش بێ گشت دەوڵەتانی ئەورروپی خاچ پەرست کۆبوونەوە بۆ ئەوەی بزانن هێزی صلاح الدین لە چ دایە بۆ لەشکری خاچ پەرست بەژمارە و بەچەك زۆرترن لەلەشکری صلاح الدین کەچی نایوێرنێ و ناتوانن چۆکی

پێدادەن، لەئەنجام گەیشتنە ئەو ڕاستیە کە ئەوان چەکی ئیمانیـان بەدەسـتەوەیە بۆیە کە خۆیان لەبەر ئەو لەشکرە کـەم چـەك و کـەم ژمارەیـە نـاگرن ، ئەوسـا بەرهەموویان بڕیاریاندا ئیتر لەمەودوا ئەو قورئانە لەنێو موسـڵمانان نـەهێڵن و لەبیریان بەنەوە تا بتوانن بگەن بە ئامانج ئەوەبوو کە کاتێ فەرەنـسیەکان ولاتـی شامیان داگیرکرد لەدوای جەنگی جیهانی یەکـەم (گـۆرۆ) ی قائیـدی فەرنـسی قاچە بۆگەنەکەی لە دیمەشق لەسەر گۆڕی (صلاح الدین) داناو گووتی: ها صلاح الدین ئەو جارەش وا گەڕاینەوە ئەوەی کە تۆ کردت بەموسڵمانانی ئەوڕۆ ناکرێ ، لەبەرچی؟ بێگوومان لەبەر ئـەوەی کەپـشتمان لـە ئایینەکـەمان کـرد. ئـەوتا (مەلای گەورەی کۆیە مەلا محەمەد جەلی زادە) لە تەفـسیرەکەی (سـورة البقـرة) دەڵێ: ئەورووپا بۆیە پێش کەوت چونکە وازیان لـە ئاینـە گۆڕدراوەکـەیان هێنـا، ئێمەش بۆیە دواکەوتین چونکە پشتمان لە ئاینە پیرۆزەکەمان کـرد ، ئـیتر بـە چاوەڕوویەك و بە چ پەرت و بیانوویەك ئێمەی موسڵمانی کورد خۆمان گوناحبـار بکەین و بڵێین ئاینی ئیسلام ئێمەی دوا خستووە؟!

## گەورەترین بوهتان و درۆ

ئاشکرایە یەك لە گوناهە گەورەکان و یەك لەو گوناهانەی کە موسڵمان ماڵ ویران دەکا توندرەویە (تطرف) (مغالات) (غلو ) ، ڕوونکردنەوەی ئەو بوهتانە پێویستی بە( مجلد ) ێکی زل هەیە . بەڵام لێرەدا بەکورتی شتێك لەوبارەوە دەنووسم تەنها بۆ ئاگاداری کردنەوەی موسڵمانی هەڵخەڵەتاو بەو بوهتانە، بۆ ئەوەی بزانن کە ئیسلام توندڕەو نییە یا ئەو موسڵمانەی کە گومانێکی وای لە ئیسلام هەیە ئەو گومانە نەمێنێ .

هێزەکانی کوفر و ئیلحاد ئەمڕۆ بووهتانی توندڕەویان کردیە بە گەورەترین کوتەك پێی لە ئیسلام دەدەن ، کە چی بۆخۆیان لە هەر هەموو توونـدڕەوانی مێژوو توندڕەوترن ، توندڕەون لە خوێن ڕێـژتن و هەڵگیرسـانی جەنگی یەکجار ترسێنەر و ماڵ وێرانکەر وەك جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم کە نزیکەی سەد ملیۆن کەسی تیا کوژراو برینـدار بـوو ، بە ملیۆنـەهاش تێیانـدا بـزر بـوون ، ئەمڕۆش لە هەموو کاتێك توندڕەوترن بۆ خوێن ڕێژی و هەڵگیرساندنی جەنگ ، هەموومان دەزانین ئەو پارەو پول و زانیـاری و تەکنەلۆجیایەی کە بۆ بەرهەم هێنانی چەك (وەك بۆمبـای ئـەتۆمی و هایـدرۆجینی و بۆمبـای نیـۆترۆنی و( موشەکی عابر القارات) تەرخانیان کردیە یەك لەسەر دەهەزاری ئەو پارەو پـول و زانیاریە یان تەرخان نەکرد بـۆ لایەنـەکانی مرۆڤایـەتی ، لـەوەش خـراپتر سـاڵ درانزەی مانگ چەکی کوشندە بەناو هەموو دونیا بـڵاو دەکەنـەوە و زۆرجـارانیش بەخۆڕایی بەسەر پیاو کوژان و تاوانبارانی دابەش دەکەن ، ئێـوە تەماشـاکەن لـە هەموو چرکەیەك یا لەهەر خولەکێك لە هەر ڕۆژێك چـەندان بـێ تـاوان یـاخود سەدان بێ تاوان دەکوژرێن بەو چەکەی ئـەوان کـە دەتـوانن دروسـتی نەکـەن یـا کەدروستیان کرد نەهێڵن بڵاو بێتەوەو بکەوێتە دەستی تاوانبارانی وەك خۆیان بـە

خۆڕایی ، کەچی بەخۆیان ناڵێن توندڕەو و پیاو کوژ ، بەو نەزان و هەڵخەڵەتاوانە دەڵێن پیاو کوژ و خوێنڕێژ و توندڕەو کە دەمانچەیەك یا تفەنگێکی ئەوانی بەدەستەوەیە و بەفەرمانی ئەوان پیاوی پێ دەکوژرێ یاخود خۆی پێ دەپارێزێ لەدەست پیاو کوژانی توندڕەوی ئەوان !!.

ڕۆژانە بای سەدان ملیۆن دۆلار هۆکارەکانی عەقڵ لەدەست دان و نامرۆڤایەتی و داوێن پیسی و دەست پیسی بڵاو دەکەنەوە کەچی هێشتا بەخۆیان ناڵێن توندڕەو و دڕندە لە هەمان کاتدا سەدان ملیۆن دۆلار لە ڕێگاکانی پڕو پاگەندە (اعلام propagnda) خەرج دەکەن بۆ ناو بەدکردنی پیاو چاکان و بوهتان پێکردنیان و دابڕانی ناوی توندڕەوی بەسەریان .

بەدرێژایی مێژوو خەریکی لەناوبردنی دەیان گەلانی بێ دەسەلات و هەژار و قوڕ بەسەرن ، ئەوسا نەخۆیان و نەخەڵکەکانی هەڵخەڵەتاو بە پیك و دوزەلەیان پێیان ناڵێن توندڕەو ، بەلام شۆڕشگێڕێکی خواناسی خەبات گێڕی موجاهید کە لەناو ئەو گەلە قوڕبەسەرانە بەتوندڕەو دەژمێرن و ناوبانگی توندڕەوی بۆ دروست دەکەن و بەخوێن ڕێژ و تاوانباری دەژمێرن.و لەگەڵ ئەوەشا موسڵمانانی بێ وا لاواز و هەڵخەڵەتاو پێیان هەڵدەخەڵەتێن و باوەڕدەکەن بە بوهتان و درۆکانیان !

(محمد مهدی جواهری) ڕاستی گوتوە کە دەڵێ:

(قَتلُ امريءٍ في غابة جريمة لاتُغْتَفَر  وَقتل شعبٍ آمن مسألة فيها نَظَرْ)

کوشتنی یەك تاکەکەس لە دارستانێ کەلەوانەیە پیاوێکی خراپ بێ تاوانێکە لێ خۆش بوونی نیە ، بەلام قەتل و عام کردنی گەلێکی ئەمین و بێ دەسەلات مەسەلەیەکە پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە

( تطـرف ) تونـدڕەوی لـە ئیـسلام نەبـەدەن نییـە ، چـونکە گوناهێـك و هەڵەیەکی گەورەیە ، گوناه و هەڵەش لەهەر پایەو پلەیەك بێ لە ئیسلام دانیـەو بەڵکو ئیسلام بەدەقی کیتـاب و سـوننەت دژی توندڕەویـەو هەمیـشە لەهـەر هەموو شتێك مام ناوەندیە ئەوەش چەند ئایەت و حەدیسێك لەو بارەوە :-

١ – ( قل يا أهل الكتاب لاتغلوا في دينكم غير الحق ولاتتبعوا أهـواءَ قـوم قد ضلّوا من قبلُ وأضلوا كثيراً وضلّوا عن سواءِ السبيل) المائدة ٧٧

خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەر ( عليه الصلاة والسلام ) کرد کە داوا لە ئەهلی کیتاب (جولەکەو دیانان) بکا کە نەکەن توندڕەوی بەکار بهێنن لە ئاینەکەیان و تەنها بەلای ڕاستیەوە بـچن ، چـونکە تونـدڕەوی کـاری هەواو هەوەسە، هەواو هەوەسیش زۆر بەتوندی لەدەیان ئایەت لە قورئـانی پـیرۆز نەهی لێکراوە ، هەروەها نەکەن بەدوای کەسانێك بکەون کە بەهۆی تونـدڕەوی و هەواو هەوەسیان گـومڕا بـوون و خـەڵکانێکی زۆریشیان دووچـاری گـومڕایی کردیەو لەڕاستی خوا لایان داوە.

ئاینی ئیسلامی پیرۆز هەرگیز توندڕەوی قبوڵ ناکاو بەتوندی ڕەتی دەکاتەوە ، چونکە بەشێکە لە کاری هەواو هـەوەس و کـاری هـەواو هەوەسـیش بـە دەقـی ئایەتی قورئان مرۆڤی پێ کافر دەبێ (وَمَن أضلُّ ممّن اتبع هـواه بغـير هـدى مـن الله)بەڕ لە هەندێ خوای گەورە داوای لێ کردین کـە لـە ئاینەکـەمان و تێگـەیشتنی کاروبـارو هەڵـسوکەوتمان مـام ناوەنـدی بـین ، تەنانـەت ئـەو شـوێنەی کـە ئاینەکەشمانی لێ دابەزیوە کە شاری (مەککە) یە ناوەندی ئیشکانیە لەسەر ئەرز (وكذلك جعلناكم أمةً وسطاً لتكونوا شهداءَ على الناس ويكون الرسـول علـيكم شهيداً ...) البقرة ١٤٣

٢ – (ولاتجعل يدك مغلولة الى عنقك ولا تبسطها كل البسط فتقعد ملوما محسورا ) الأسراء ٢٩ . نەکەی هێندە بەخیل و قرچۆك بی ، دەست لە بینەقاقای خۆت بنێی و نەکەی و نەخۆی لەبەر سەقیلی و قرچۆکی هەروەها نەکەی هێندەش دەست بلاو بی و ئیفلاس بە خۆت بکەی .

٣ – لەباسی (عباد الرحمن) لە سورەتی (الفرقان) دەفەرموێ (... اذا انفقوا لم يُسرفوا ولم يقتروا وكان بين ذلك سبيلاً ) ، واتە موسلمانی ئیمان تەواو بەهێز بەخوای خۆیان هەرکاتێ ماڵیان خەرج کرد نە سەقیلی تێدا دەکەن و نەدەست بلاوی ، بەڵکو ما ناوەندن .

٤ – ( ومن قتل مظلوماً فقد جعلنا لوليه سلطاناً فلا يُسرف في القتل انه كان منصوراً ). الأسراء .

کوشتنی خەڵکی بێ تاوان گەورەترین تاوانە لە نێو بەرنامە پیرۆزەکەی ئیسلام لەدوای هاوبەشی پەیدا کردن بەخوا ، خوای گەورە سزای یەکجار توندی بۆ دانایە لە رۆژی دوایی وە بە هیچ جۆرێك لێخۆش بوونی نیە (ومن يقتل مؤمناً متعمداً فَجزاؤُهُ جهنم خالداً فيها وغضب الله عليه ولعنة و أعدَّ لهُ عذاباً عظيماً) النساء .

لەگەڵ ئەوەشا موسلمان هەرکاتێ بەناحەق کوڕێکی کوژرا یا برایەك یا ئامۆزایەك نابێ توندڕەوی بکا لە تۆڵە سەندنەوە بە هیچ شێوەیەك (فلا يسرف في القتل) ئەگەر لەخوێنی خۆی خۆش بێ ئەو چاکترە (وان تعفوا أقربُ لتقوى ولا تنسوا الفضل بينكم إن الله بما تعملون بصير) البقرة ، ئەگەر چی مەسەلەی عەفو لەو ئایەتە عەفو کردنی ئەو کەسەیە کە ئافرەتی تەلاق دەدا بەر لەوەی دەستی بەدەستی بکەوێ لەو ماوەیەی کەلەسەری فەرز کرایە ، بەلام مەسەلەی عەفوکردنی هەر گوناهبارێ لە گوناهەکەی لە لایەن خاوەن حەق شتێکی پیرۆزە لەلای خوای گەورەو موسلمانان ، وە ئەگەر لە خوێنی خۆشی خۆش نەبوو ئەوە

پێویستە تەنھا ئەو کەسە بکوژێتەوە کە قەتلەکەی کردیە نابێ لە بری قاتل برای یا باوکی یا کوڕی یا ئامۆزای یا ھەر کەسێك لـە بنەماڵەکـەی بکوژێتـەوە ، وە یاخود لەبری یەکێ دووان یـان سـێیان بکوژێتـەوە، ئـەوە سروشـت و سـیفەتی خەڵکانی جاھیلی بوو لەنێو قورەیشیەکان بەر لە ھاتنی ئیسلام .

ھێزەکانی کوفرو ئیلحاد ئەمرۆ بە موسڵمانان دەڵێن توندڕەو کەچی خۆیان و سیفەت و ڕەوشتی بەدی خۆیان بەسەر ئێمە دا ساغ دەکەنەوە ، بۆت ڕوون بۆوە کە حوکمی ئیسلام چۆنە لەبەرامبەر (کوشتن) ئەوسا کە یەکێ لـە موسـڵمانان بـە پێچەوانەوە ئەو حوکمە ڕاستە ڕەفتار دەکا بێگومـان ئیـسلام بەرپرسـیار نییـە ، بەڵکو ئەو کابرایە خۆی بەدوا ھەواو ھەوەسی

خۆی کەوتوە ، بەڵێ ھێزەکانی کوفر و ئیلحاد ھەموو تاوان و سیفەتی خۆیان کە ھەر ھەموو شەیتانیە ، بەسەر ئێمەدا دەبڕن لە کاتێ ھەموومان ڕۆژانـە دەبیـنین لـەبری کوشـتنی سـەربازێکیان دەیـان و سـەدان دەکوژنـەوە یـاخود بـە ھێـزە ئاسمانیەکانیان شارێکی موسڵمانان کاول دەکەن و ھێشتا بە خۆیان ناڵێن توندڕەو ، بە ئێمە دەڵێن توندڕەو. ھەموو ڕۆژێـك ئـەو دیـاردە دڵتەزێنـە لـە فەلەسـتین دووبارە دەبێتەو، جولەکەکان لەبری خوێنی سەربازێکی جولەکە چـەندان منـاڵی سـاوای ناوبێـشکە دەکـوژن یـان دەیـان کەسـی بـێ تـاوان بـە تـۆپ و فڕۆکـە شەڕکەرەکانیان دەکوژن و بریندار دەکەن بەدەیان خانوو بەرە لەگـەڵ زەوی جـووت دەکەن.

٥ – پێغەمبـەری خۆشەویـست وبـەڕێزمان ( علیـه الـصلاە والـسلام ) لەفەرموودەیەکی بەناوبانگ دەفەرموێ : (ھلـك المتنطعـون ھلـك المتنطعـون...) وابزانم سێ جـاران ئـەو فەرموودەیـە دووبـارە دەکاتـەوە و دەفـەرموێ تونـدڕەوان بەھیلاك چوون ، توند ڕەوان بەھیلاك چوون توندڕەوان بـەھیلاك چـوون. ئـەوجا توندڕەوەکە لەھەر کاروبارێکی دینی یـا دونیـەوی بـێ، کەواتـە توونـدڕەوی لـە

ئیسلام دانیه و نابێ ، توند ڕەوی تەنهاو تەنها کـارو تـاوانی هێزەکـانی کـوفر و ئیلحادە، بەڵام بۆ بە ئێمە دەڵێن توندڕەو؟ لەبەر ئەوەی دەیانەوێ هەموومـان قەتل و عام کەن ، هەموو ولاتمـان داگیروتـالاّن کـەن ، ئێمـەش وەك بەرخۆکـەی بـن چەقۆی قەساب دەنگیان لەگەڵ ناکەین ئەوسا پێمان بڵێن ئەی لەو بەرخە چەتونە خۆ لەشی لە خوێن نەهێشتین .

بەکورتی: ئایینی ئیسلام یەك لەو گوناهانەی کە بەتووندی نەهی لێ کردیـە توندڕەویە بەهەموو جۆرەکانیەوە ، بەڵام ئێمەی موسڵمان بەلای هێزەکانی کـوفر و ئیلحاد هەر بە توندڕەو دەژمێردرێن تاوەکو خۆیان غـەرقی کـوفر و ئیلحادمـان نەکەن ئێمە هەر بە توندڕەو لەقەڵەم دەدەن

وەك خوای گەورە دەفەرموێ: (ولَنْ ترضى عنكَ اليهود ولا النـصارى حتـى تتبـع مِلّتهم قُل إن هدى الله هُو الهدى ولأن آتبعت أهواءَهم بعدَ الذي جاءك من العلـم مالك من الله من ولي و لا نصير ) البقرة ١٢٠ .

لێتان مسۆگەربێ (دەبێ لێمان مسۆگەر و مەعلوم بێ ) هێزەکانی کـوفر و ئیلحاد ئێمە هەر بەتوندڕەو دەزانن و بە دونیا دەناسێنن با وازیش لە هەر هـەموو ئاینەکەمان بهێنن و تەنها بڵـێن (لا الـه الا الله محمـد رسـول الله) تـا واز لـەو هەندەش نەهێنین هەر بەتوندڕەو دەژمێرن و لەناوبردنمان بە کـارێکی پێویـست و شەرعی دادەنێن.

با هەمیشە ئەو نهێنیە لەبیر نەکەین و بزانین بۆچی هێزەکانی کوفرو ئیلحاد بەهەموو هێز و تواناپانەوە دەیانەوێ ئەو ئایینە پیرۆزەمان لە نێو دڵ و دەروونمـان هەڵکێشن و لەبیرمان بەنەوە، چونکە چاك دەزانن کە بڕبـڕەی پـشتمانە ئـیتر کـە مرۆڤ بڕبڕەی پشتی نەما بە دەست و قاچیش هیچی پێ ناکرێ، کە مـرۆڤ بڕبـڕەی پشتی نەما عەقڵ و بیر و هۆشیشی لەدەست دەداو ژیانی لەدەست دەدا .

١٦ – هەموو سەرچاوەکانی مێـژوو لـە ڕۆژهـەلاّت و ڕۆژئـاوا ، کەزۆربـەی هەرەزۆری بەدەستی گاوران نووسراوەتەوە دانیان پیّ داهێنایە کە هـەموو جیهـان بەتایبـەت ولاّتـە ئەورووپیـەکان قـەرزاری ژیـاری و شارسـتانیەتی ئیـسلامن ، هەرهەموویان دانیان پێداهێنایـە ئـەوبیرو بـاوەڕو شارسـتانیەت و ژیاریـەی کـە ئیسلام دروستی کردیە لەسەرەتای هاتنی وێنەی نەبووە لەچاکی و لـە ڕاسـتی و بەدرێژایی مێژووی مرۆڤ ، ئەوەی کە ئاینی ئیسلام لەماوەیەکی زۆر کەم ئەنجامی دا بەشێوەیەکی یەکجار ئەرێتی(ایجابی) لـەژیانی سـەر ئـەرز هـەرگیزاو هەرگیز مرۆڤایەتی بەخۆوەی نەبینیوە لەڕابردوو نە لەداهاتوو....

ڕاستە ڕۆمانەکان و یۆنانەکان و میـصریەکان و چـینیەکان ، شارسـتانیەتی بـەرفراوان و پێـشکەوتوانەیان لـە مێـژوو پێکـەوە نـاوە ، بـەلاّم هـەر هـەموو شارستانیەتی خۆیان لەسەر حیـسابی خـوێنی گـەلان و کەللەسـەری ملیۆنـەها مرۆڤی بیّ تاوان دروست کردیە ، بەلاّم ئیسلام بـەدانپیێهێنانی هـەر هـەموویان لەڕێگەی کیتاب و سوننەت شارسـتانیەتی لەسـەر ئـەرز و لـە مێـژوو دروسـت کردیە و سـتەمی لـەهیچ گـەلێکی لاواز نەکردیـە لـە پێنـاو دروسـت کردنـی شارستانیەت و پێـشکەوتنی خـۆی ، سـەدانی وەك ڕۆژهـەلاّت ناسـی فەرەنـسی (گۆستاف لۆبۆن) دانیان بەو ڕاستیە داهێنایە . باشە ئاینێك هـەموو زانیـان و ڕۆژهەلاّت ناسانی دونیا شاهیدی چاکی و پاکی پێشکەوتن و پێشکەوتنخوازی بۆ بدەن بۆ دەبیّ لە ئێمەی کورد بووبێتە بەلا ؟ ( أعوذ بـالله )مـن وادەزانم خۆمـان بەمل خۆمانەوە بوینە بەلا نەك شتێکی دیکە یاخود کەسانێکی دیکەو زانایانی هەموو دونیا باسی گەورەیی و ڕاستی ئیسلام دەکەن و دەلّێن مـرۆڤ و مێـژوو بـە تێکڕا قەرزاری فەزل و شارستانیەتی ئیسلامە ، بەلاّم ئەوانەی لـە ئێمـەی کـورد گلەیی لە ئیسلام دەکات یا دەیخاتە بەر شـالاّوی هێرشـە ناڕەواکـانی بەشـاهیدی کارو کردەوەی خۆیان هەرهەموو یان جاهیل و گێل و وێل و نەزان و سەرگەردانن،

ئایا مرۆڤی خاوەن ژیر و هۆش و بیر و وریاو ئاگا لەخۆ بەقسەی کامیان دەکا بە قسەی زاناکانی دونیا یا جاهیلەکانی کورد؟

ڕاستە بەناوی ئیسلام دوژمنانی ئیسلام زۆرجار فێڵیان لێ کردینە، باشە ئێمەش وەك ئەو فێڵبازانە مرۆڤ نین؟ بۆ ئێمە دەستی خۆمان پێش نەخست بەرلەوەی ئەوان فێڵمان لێ بکەن ئێمەی کوردیش با لەڕێگەی ئیسلام فێڵمان لێ کردابان و ئەگەر ولاتیشمان لێ داگیر نەکردابان با هەرتەبا لێنەگەڕابایین ئەوان ولاتی کوردستانیان داگیر کردابا ئاخۆ چیمان لەوان کەمترە؟. گەر ئەوان گەل بوون ئەی ئێمە وەك ئەوان گەل نەبووین؟ بۆ ئەوان بۆ لە ناو بردنی ئێمە دەست پێشخەربووین. بۆ ئێمە دەستی خۆمان پێش نەخست؟ دیسانەوە دەڵێم چیمان لەوان کەمترە؟

١٧ - ئەمڕۆکە ئاینی ئیسلام لە لایەنی ئابووری و لەشکری لەهەموو سەروەختەکانی ڕابردوو لاواز ترە، لە خوای گەورە بەولاوە کەس نیە بەرگری لێ بکا مەگەر هەندێ گروپی پچڕ پچڕ لەم لاو لەولای گێتی لەسەر ئەوە شەوە ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی ڕۆڵەکانی لە زیاد بوونە بەتایبەت لە ولاتانی کوفر و ئیلحاد! ئایا دەزانن ئەوانەی کە لەو ولاتانە موسڵمان دەبن کێن؟ واللە نەکرێکاری هەژارن و نەجووتیاری بێکارن و نەهەژارو دەست کورتی نێو کەلاوەکانی ولاتی کوفر و ئیلحادن، بەڵکو لە سەدا نەوەتیان زانای بەناوبانگی پزیشکی و گەردوونی و فیزیایی و کیمیائین کەتواناییان هەیە کاریگەری لەهەزاران هەزار کەسانی تر بکەن کە ڕێڕەوی ئەوان بگرن، لێرەدا دەبێ بزانین کە هەردەبێ فەرموودەی خوای گەورە بێتەدی، دەبێ بزانین کە هیچ بەربەستێك و هێزێکی بەربەست دژ بە ئیسلام نیە پێش لەفەرموودەکانی خوای گەورە بگرێ کە نەیەتەدی، دەبێ هەر بێتەدی و بێتەدی دەفەرموێ (... إنما يخشى الله من عباده العلماءُ إنَّ الله عزيز غفور)، واتا: ئەوانەی کە لەخوای گەورە دەترسن و بەڕاستی دەیپەرستن تەنها

کەسانێکی زانان و ئیتر خوای گەورە هیچ هێزێك نیە کە لە هێز و دەسەلاتی کەم کاتەوەو پەکی بخا ، چونکە هەرچی هێز هەیە لەدروستکراوی خۆیەتی هەر لە سەرەتاوە ، هەروەها خوای گەورە یەکجار لێ خۆش بووە لەو زانایانەی کە دەگەڕێنەوە سەر بەرنامە پیرۆزەکەی .

هەموو ڕۆژێ کەناڵە ئاسمانیەکانی ئیسلامی چەندان هەواڵی دڵخۆشکەرمان بۆ بلاو دەکەنەوە لەبارەی گەشە کردنی ئیسلام لە ولاتانی کوفر و ئیلحاد ئەوتا (کەناڵی الرسالە) بلاوی کردەوە کە ئاینی ئیسلام لە ساڵی ٢٠٦٠ لەفەرەنسا ڕێژەی موسڵمانان دەگاتە (٦٠٪) و لە ئەڵمانیا لە ساڵی ٢٠٢٠ ڕێژەی موسڵمانان دەگاتە (٤٠٪) .

ئایا ئەو هەموو خەڵکەی ئەمڕۆ موسڵمان دەبن لە ولاتانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات و یابان و چین ، بۆیە موسڵمان دەبن تاکو ئیسلامەتی دوایان بخاو بەرەو دواوەیان بگەڕێنێتەوە وەك ئەو کوردانەی ئێمە کە پێیان وایە ئاینی ئیسلام کوردی دواخستیە؟ ئایا لەبەر ئەوەیە حەز بەدواکەوتن دەکەن و لەپێشکەوتن زۆر بێزار بوونە و سەرچاوەی دواکەوتنی خۆیان لە ئیسلام دۆزیتەوە و هیچ شتێکی تر نیە دواکەوتنی لێ بەدەست بێنن؟ یاخود نهێنیەکی زۆر گەورە لەو مەسەلە گەورەدا هەیە ڕەنگە ئێمە نەیزانین؟ ئەو کاکە کوردانەی دەڵێن ئاینی ئیسلام بەزۆر بلاو کرایەوە ، ئاخۆ دەبێ کێ ئەو زۆریە لەو هەموو زانا و دانای ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا و یابان و چین بکا بۆ ئەوەی موسڵمان بن؟ بێگومان پەرەسەندنی ئیسلام لە ولاتانی کوفر و ئیلحاد لەڕۆژگارێ کە ئیسلام لە هەموو سەروەختێك لاواز ترە ئەو گۆتە گۆتانەی هەموو بەدرۆ خستەوە و ڕووی خاوەنەکانی ڕەش کرد ، ئەو دیاردەیەی ئیسلام بوونی خەڵك سەپاندی کەهەرگیز ئاینی ئیسلام بەزەبری شیر و تیر بلاو نەکرایتەوە بە درێژایی مێژوو وەك لە پێشتر گووتم لە سەدا نەوەتی ئەوانەی لەو ولاتانە موسڵمان دەبن زانا و دانان ، مرۆڤی

زاناو دانا هەمیشە بەدوا زانینی زیاتر دەگەڕێ و هەمیشە دەیەوێ زاناتر و داناتر بێ دیارە ئەو ڕاستیەشیان لە نێو لاپەڕەکانی کیتاب و سوننە دۆزیتەوە بۆیە موسڵمان دەبن ، ئایا ئەو براکوردانەی پێیان وایە ئیسلام کوردی دواخستیە ( أعوذ بالله ) دەبێ دەرس و پەند لەو هێندۆکە ڕاستیانەی کە من نووسیوەتم وەرنەگرن و داوای لێ بووردن (ئەلمەوردوا ) لە خوای گەورە نەکەن؟

لەهەمووی دونیای ئیسلام بەدرێژایی مێژوو کەسێ نەیویستووە و نەیدیوە زانایەکی موسڵمان ببوبێتە جولەکە یا دیان ، بەلام دیتراوە و بیستراوە کە دەیان و سەدان قەشەو مەتران و بەتریرك بوون بە موسڵمان و دەبنە موسڵمان بەبەردەوامی، ئەو دیاردەیە ئایا چ دەگەیەنێ بۆ ئاینی ئیسلام؟ بێ گومان زۆرن ئەوانەی کە دەڵێن: ڕۆژانە چەند موسڵمان دەبن لە کافران هێندە پتر لە ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە، تا ڕادەیەك ئەو شتە ڕاستە، بەلام کێن ئەوانەی کە لە ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە ؟ ئایا لە ئاستی زانین و زانیاری و زانست و ڕەوشتی بەرزی وەك ئەو کافرانەن کە موسڵمان دەبن لە ولاتە هەرە پێشکەوتووەکانی جیهان؟ نەخێر والله والله کەسانێکن بەکەلکی هیچ شتێك نایەن و کاتێ هەڵدەگەڕێنەوە هەندەی پێ ناچێ کافران لێیان بێزار دەبن و تف و لەعنەتیان دەکەن، کەواتە ئەو کەسانە واچاکە هەر لەکۆڵ ئیسلام و موسڵمانان ببنەوەو ئاو و ئاوچن بەڕێژەی سەدا سەد جیاوازن لەگەڵ ئەو زاناو داناو پیاوە ڕەوشت بەرزانەی کە لەناو ولاتی کوفر و ئیلحاد موسڵمان دەبن، کاتێ کە موسڵمان دەبن ئەوجا خەڵك زیاتر سوودیان لێ وەردەگرێ و سوود نەك بەگەلەکەی خۆیان بەلکو سوود بە هەموو دونیا دەگەیەنن و دەبنە هێمای ڕەوشت بەرزی و خاوەن عیزەت و مرۆڤایەتی .

خوێنەری بەڕێز: دوژمنایەتی هەر بەرنامەیەکی ژیانت کرد یا دوژمنایەتی هەرکەسێکت کرد پێویستە لەسەرت بەلگەی تەواو و ڕاستی ئەو دوژمنایەتیەت

بەدەستەوە بێ . واتا : تۆ لەسەر ڕاستی بی ئەگەر نا شاهیدی لەسەر خۆت دەدەی کە تۆ تێکدەری و ئاژاوەچی و دوواکەوتووی .

١٨ – گریمان ئایینی پیرۆزی ئیسلام کۆسپ و تەگەرە بوو لە پێش گەلی ئێمەی کورد ( کە هەرگیز نابێتە کۆسپ و تەگەرە ) ئایا عەیبێکی یەکجار گەورە نییە بەسەر شانی گەلێکی چەندەها ملیۆن نەتوانی ئەو

عەیبە گەورە لەکۆڵ خۆی بکاتەوە دوای پتر لە هەزار و چوار سەد ساڵ تێپەڕ بوون بەسەر موسڵمان بوونی ؟ ئایا ساڵی یەکەمی موسڵمان بوونمان نەمان زانی کۆسپ و تەگەرەیە؟ ساڵی دووەم و سێ یەمیش هەروەتر؟ خۆ دەبوایە لە سەدەی یەکەمی موسڵمان بوونمان بزانین و وازی لێ بێنین؟ لەکاتێکدا دەزانین گەلانی دونیا بەسەدان و هەزاران کێشەو بەلاَ و کۆسپ و تەگەرە کەوتیتە پێشیانەوە لەکاتی خەباتیان لە پێناو دامەزراندنی دەوڵەت ، کەچی بەسەر هەر هەموویاندا زاڵ بوونەو بەئامانج گەیشتینە .

زۆر کەس لە ئێمەی کورد دەڵێن: ئێمە دەزانین خودی ئایینەکە پاك و ڕاستە و فێڵی لێ نەکردینە ، بەلاَم گەلانی موسڵمانی دەورو بەرمان وەك ( فارسەکان و عەرەبەکان و تورکەکان ) لە پەنا ئیسلام فێڵیان لێ کردینەو لێ نەگەڕاین ببین بە خاوەنی دەوڵەتی خۆمان؟! ئەی کە بۆچوون و بیرو ڕایەکی هەڵەیەو لەڕاستی و واقیع دوورە ؟! باشە ئەی ئێمەش وەك ئەوان مووسڵمان نەبووین بۆ لە پەنا ئایینی ئیسلام بۆ ئێمە فێڵمان لەوان نەکرد؟ گریمان عەرەب ئایینەکە بە زمانی خۆیان بوو و لە ئێمە چاکتر تێگەیشتبوون چاکتر توانیان سوودی دونیەوی لێ وەرگرن و چاکتر توانیان ( کیتاب و سوننە ) لە بەرژەوەندیەکانی خۆیان بەکار بهێنن باشە خۆ تورك و فارس وەك ئەوان نەبوون کەچی ئەوانیش گەلێ ژیرانەتر توانیان لە پەنا ئیسلام فرت و فێڵەکانیان بەناو جەرگەی کورد دادەن؟ باشە بۆ ئێمەی کورد لەو بارەوە دەستی خۆمان پێشنەخست ، یاخود هەر نەبێ لێنەگەڕێن فێڵ و

فرتمان لێ بکەن؟! دەیان ساڵە یان سەدان ساڵە دەڵێین و دەیڵێینەوە فارس و عەرەب و تورک لەپەنا ئیسلام سەریان لە قوڕ ڕۆچواندین ، جارێک لەجاران بەڕاست و دروستی بیرمان نەکردەوە ئەو پرسیارانە لە خۆمان بکەین ؟!

ئاخۆ دەبێ نەخۆشی کوشندەمان ئایینی ئیسلامی پیرۆز بێ یا گورجی کوشندەی فارس و عەرەب و تورک کە بۆخۆمان تیرەقەی پشتمان بۆ ڕووت کردینە کە بەکەیفی خۆیان بەو گورجە کوشندە بکەونە سەرمان؟ ! خیانەتی ئەو سێ گەلەبێ لێمان یا خیانەتی خۆمان بێ لە خۆمان؟

خیانەت چی یە؟ خیانەت مونافیقیە، دوژمنەکەت لەسەرەوە جارێ برایەتی و ڕێکەوتنت لەگەڵ بکا ، لەبنەوەش بنکۆڵت کاو بەناخی زەویت دا بباتە خوارێ . بێگومان کە یەك جار بە درێژایی مێژو دوژمنت ئەو جۆرە فێڵەی لێ کردی ئیتر نابێ تۆ ڕێگە بدەی دووبارە ببێتەوەو نەك سێ بارەو دەبارە وەك پێغەمبەری خۆشەویستمان دەفەرموێ ( علیه الصلاە والسلام ) لە حەدیسێکی ڕاست و ڕەوان : (لا يُلدَغُ المؤمنُ في جُحْرٍ مَرَّتَينِ ) . مرۆڤی خودان باوەڕ دووجار لە یەك کونە دوپشك ، دوپشك پێوەی نادا.

بێ گومان لە خیانەتی دوژمن لێمان خراپتر خیانەتی خۆمانە لە خۆمانی دەکەین ئەو جۆرە خیانەتە بەدەیان جار سامناکتر و کاریگەر ترە لەسەر لەناو بردنی گەل. ئەو خیانەتەیە ئێمەی کورد بەدرێژایی مێژوو پێوەی گیرۆدەو گرفتار بووینەو سەری هەموو ماڵوێرانیەکانمانە .

## نهێنیەکانی دواکەوتنمان

تکا دەکەم لە خوای گەورە کە ڕاستیم پێکابێ لەو بارەوە کە ئایینە پیرۆزەکەمان هەرگیز بەرپرسیار نیە لە دواکەوتنی گەلەکەمان گەلی کوردی موسڵمان ، دیسانەوە داواکارم لە خوای گەورە کە هەر نەبێ چەند برا کوردێکی لەو هەڵە گەورەیە گێڕابێتەوەو لەو بیرو ڕایەی پەشیمان بوویێتەوەو چیتر پێی وانەبێ کە ئاینی ئیسلام کە ڕاستیەکی ڕەهایە ،کوردی بێ بەش کردیە لە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی و لەدەست ڕاگەیشتن بە هۆکارەکانی پێشکەوتن لەو دنیا ئاڵۆزەی ئەوڕۆ .

وابزانم کاتی ئەوە هاتووە کە هەموومان بزانین نهێنی نەبوونی ئەو دەوڵەتە کوردیە چیەو دوای ئەوەی بە ئیزنی خوای گەورە زانیمان ئیسلام بەرپرسیار نییە.

لەوەتی چاوم لە دونیا هەڵێناوە و گوێم بۆ گوێ لێ بوون و گوێ ڕاگرتن کراوەتەوە و زمانم بەووتە شیرینە کوردیەکان پژاوە و کەوتوومەتە نێو بازاڕی ژیان بە هەموو ئاڵۆزی و پاڵۆزیەکانیەوە بە هەموو گیرو گرفتەکانیەوەو کێشەوبەرەکانی ، لەوەتی بەدوای ڕاستی دا دەگەڕێم و بیدۆزمەوە لەوەتی وەك زۆرینەی خەڵك خۆم خەریك کردیە بەزانین و ئاگادار بوونەوە لە لایەنەکانی ژیانی ، وەك لایەنی سیاسی و ئابووریو کۆمەڵایەتی و لەشکری[؟] زانیاری ئەو یەك دوو قسەیەم کەوتۆتە بەر گوێ و تا ئێستاش نەبڕاوەتەوە و دەکەوێتە بەرگوێم کە گوایا گەلی کورد سێ شت دوای خستیە و لێی نەگەڕایە کە بۆخۆی وەك هەموو گەلانی جیهان دەوڵەتێکی سەربەخۆ دروست بکا ئەوانیش :

١- یەکیان گوایە ئیسلامە کە بە ئیزنی خوا بەدرۆم خستیتەوە کە ئیسلام هەرگیز تاوانبار نیەو نابێ لە نەبوونی ئەو دەوڵەتە

٢- لەبەر ئەوەی گەلەکانی دەوروبەرمان زێدە دوژمنمانن و هەرگیز ڕێگەیان پێ نەداوین کە بۆخۆمان ببینە خاوەنی ماڵی خۆمان .

٣- لەبەر ئەوەی کە خاکی کوردستان نیشتمانێکی داخراوەو لە هیچ لایەکەوە نەکەوتیتە سەر دەریایەك لە دەریاکانی جیهان .

ئەو سێ شتە یا ئەو سێ هۆیە لە نێو مێشکی ڕۆڵەکانی کورد وەك ڕاستیەکی ڕەهای لێ هاتیەو هیچ شك و گومانێك لە ڕاستیان ناکرێ و ئیتر چارەی ئەو سێ هۆکارە ناکرێ و تا دونیا دونیایە هەردەبێ ژیانی کۆیلایەتی و ژێر چەپۆکی و نۆکەری بەینەسەر، جا تۆ سەیرکە کوردی بەرەو چ قۆناغێکی لاوازی و سستی و هیوا بڕاوی قوڕبەسەری بردیە کە

بێ گومان ( من سەد جاریش بێ گومانم ) کە هەرسێ هۆکارەکە درۆنەو بەردی بناغەیان لەسەر درۆ و گێلی خەڵك دامەزراوە ، بەردی بناغەیان لەسەر سەگایەتی و فێڵبازی دوژمنەکانمان و خائینەکان دامەزراوە، هەرسێ هۆکارەکە فریان بەسەر ڕاستیەوە نیە ، وەك مێژوو واقیع بۆمان دەسەلمێنن و هەرسێ هۆکارەکە ڕەت دەکەنەوە . یەکمان ڕەت کردەوە، ئەوسا دەست بە دووەم و سێ یەمیان دەکەین بەئیزن و بەیارمەتی خوا.

٢- ئایا گەلانی دەوروبەرمان ( فارس و عەرەب و تورك ) لێ نەگەڕاین دەوڵەتی کوردی لە کوردستانی گەورە دروست بێ ؟ ئایا درۆیە ، ڕاستە ؟ بێ گوومان درۆیە. بۆچی؟ گەورەترین زیانی ئەو درۆیەو پەخش کردن و سەپاندنی لە نێو دڵ و دەروون و مێشك و بیر و هۆشی کورد بویتە بەڵگەیەك لەو بەڵگانەی کە کورد بەگێل و وێڵی بە جیهان بناسێنێ و بۆ هەموو دونیای ئیسپات کا کە کورد مێشکی لەبیرکردنەوە ڕاوەستایەو توانای بیرکردنەوەی نییەو ناتوانی بەدوای ڕاستیدا بگەڕێ و هەمیشە بەدوای هەڵلایی دەکەوێ و نەگەرنا بەو درۆ مێژووییە باوەڕناکا کە گوایا گەلانی دەوروبەری لێ نەگەڕایین دەوڵەت بۆخۆی دروست کا

با لێرەدا کەمێ بەوردی سەیری مێژو و واقیع و نەخشەی جیهان کەین و ئەوسا پرسیار لەخۆمان کەین ، ئایا دەوڵەت و حکومەتە بچووکەکان و بێ هێزەکانی دونیا بە گەلانێك گەمارۆ دراون کە ئەو گەلانە برای پشتێ و مام و ئامۆزایانن ؟ یاخود وەك ئێمەی کورد لە هەموو لایەك بە دوژمنانیان و ناحەزانیان دەورە دراین؟ ئەو هەموو دەوڵەتە بچوکانەی سەر زەوی بەهۆی دەوڵەتەکانی دەوروبەریان بووین بە حکومەت و سەربەخۆیی خۆیان وەرگرتیە؟ ئایا ئەو دەوڵەتانەی دەوروبەریان باوك و برایانن ئەوانەیان کردیە بەدەوڵەت؟ نەخێر.

دەوڵەتانی دونیا یا بابڵێین زەوی لەوەتی دەوڵەتی بەخۆوە بینیە هەر هەموویان خەریکی خواردنن و لەناوبردنی یەك بوونە، هیچ دەوڵەتێك، هیچ گەلێك بۆ گەلەکەی دراوسێی نەبووە بە باب و براو بیکا بەحکومەت وەك چۆن سەیری خۆی دەکا سەیری ئەویش بکا، مێژووی ئەرز لە سەدا نەوەتی پتر هەموو شەڕو جەنگە، ئەو شەڕو جەنگانەش زیاتر لە میانی ئەو گەلانە ڕووی دایە کە دراوسێی یەکترن و هەریەکەیان هەوڵی داوە بەهەر ڕێگەیەك بێ دەوڵەتانی سەر سنوری بکا بە بەشێك لە وڵاتەکەی خۆی و گەلەکەی لەناوبات و خۆی دەست بەسەر خاکەکەی دابگرێ کەم وا هەبووە گەلێکی گەورە گەلێکی بچوکی دراوسێی بکا بەدەوڵەت مەگەر لە بەرژەوەندیەك و هۆیەکی یەکجار زل نەبێ، وەك چۆن (هیند) لەشەستەکان (بەنگلادیش) ی کردە حکومەت و لە پاکستانی جیا کردەوە لەبەر هۆی لەشکری و ئاینی، لەبەر ئەوەی پاکستان دەوڵەتێکی ئیسلامیەو ویستی لەلایەن عەسکەری و ئابووری لاوازی بکا ، ئەگەرنا گەلانی دونیا لەوەتی سەریان هەڵداوەو ئەرزیان ئاوەدان کردیتەوەهەر خەریکی خواردنی یەك بوونە ، سەروەختێ ئەو بەریتانیایە دەیویست ئەمریکا بخوا، ئەگەر چی ئەمریکا زۆربەی وەك بەریتانیەکان ئینگلیزن. بەر لە میلاد ئیتاڵیا دەیویست

بەریتانیا بخوا بۆ ماوەییێ لە ژێر دەستی بەداگیرکراوی مایـەوە ، ئـەو ڕوسـیای وا زەبەلاح سەردەمیێ قەڵەمڕەوی وڵاتی سوید بوو ئەگەرچی سوید گەلێ لـە ڕووسـیا بچوك تر بوو.

بەکورتی شەڕو جەنگ و پێکدادان لەمیانی گەلانی ئەرز شـتێکی سروشـتی بووە، تا ئەوڕۆش هەر بەردەوامە، ئەوجا گەل ئەو گەلەیە و ئەو گەلە بوو کە ژێـر دەستی وەك کورد قەبوڵ نەکردبێ و نەیهێشتبێ گەلانی دەوروبەری بیخۆ.

هـەموو گـەلێك هەمیـشە خـۆی دانووسـاندووە لەبەرامبـەر گەلـەکانی سەرسـنوری هەرکـە دەرفـەتێ بـۆ ڕێککـەوتبێ پـەلاماری دایـەو کردویـە بـە خزمەتکاری خۆی و نیشتمانەکەی کردیە بە بەشێك لە نیشتمانەکەی خۆی، ئـەو حاڵەتە ڕاستیەکی مێژوویی و واقیعیە، هەتا ئەوڕۆش هەر بەردەوامـە و هـەرگیز گەلێکی بەهێز گەلە لاوازەکەی دراوسێی دەست بەسەردا نەهێنایەو نەیپارسـتیە لەدەست دوژمنانی مەگەر لەبەر بەرژەوەندیەکی یەکجار پێویست نەبێ .

والحاصل : گەل ئەو گەلە بووە لەبەرامبەر گەلانی دراوسێی خۆی ڕاگرتبـێ و بەهیچ شێوەیەك سـەری بـۆ شـۆڕ نـەکردبێ و هەمیـشە سـورر بـوویێ لەسـەر سەربەخۆیی و پاراستنی سنوری وڵاتەکەی لەدەسـت گـەلانی دەوروبـەری. ئـەوەتا وڵاتی پۆڵەندا لەسەر دەسـتی گـەلانی دەوروبـەری پێـنج جـار لەسـەر نەخـشەی ئەورووپا ڕەش کرایەوەو هەر پێنج جارەکە خۆی زیندوو کردەوەو وەك گەلی کورد ژێر دەستی و ژێر چەپۆکی و نۆکەری گەلانی دەوروبەری قەبوڵ نەکرد

کەواتە ڕاست نییە بڵێین فارس و عەرەب و تورك نەیانهێشتووە ئێمەی کـورد ببین بە دەوڵەت، نەخێر ڕاست نییە، ئەگەر ئـەوانیش نـەیان هێـشتووە بـبین بـە دەوڵەت ، کە ئەمەش یاسای سروشتی گەلانە ، ئێمە خۆمـانیش نـەمان ویـستوە ببین بە دەوڵەت، ئەگەر ئێمە خۆمان بمان ویستابا ئەوان نەیان دەتـوانی مـەنعمان بکەن و ڕێگەمان لێ بگرن .

باشە ئێمەی کورد لە ئاسیا لە کۆنترین گەلانی سەر زەوین ئێمە بۆ نەبووینە ئەو گەلە کە نەهێڵین فارسەکان بین بە دەوڵەت کە وەك ئەوان قوڵین لە مێژوو ، بۆ هێشتمان فارسەکان بین بە گەلێك لەو گەلانەی کە ڕێگەی دروست کردنی دەوڵەتیان لە ئێمە گرتیە؟ ئەوانیش قەیدی ناکا، خۆ ئێمەی کورد گەلیٚ لەو ناوچەیە کۆنترین لە عەرەب و تورك کە ئێمە سەر وەختیٚ لە خاکی کوردستان خوا دروستی کردین عەرەب و تورك هەر ناویان نەبووە ئەی بۆچی ئەوان بەغەریبی هاتن و بوونە بەلاٚ لە ئێمە کە نەهێڵن دەوڵەت دروست کەین ئێمە لەوان نەبووینە بەلاٚ ، ئەوان دەوڵەت دروست کەن و ئێمە ببین بە ئەو گەلە کە ئەو دوو گەلە مەنع کەین لەدامەزراندنی دەوڵەتیان؟ خۆ دەبایە ئێمە ئەو گەلەبین مەنعی ئەوان بکەین نەك ئەوان مەنعی دەوڵەت لە ئێمە بکەن ، چونکە ئەوان غەریب بوون لە ناوچەکە ئێمە خاوەن ماڵ بووین و هەمیشە خاوەن ماڵ شارەزاترە لە میوانێکی غەریب؟! کەچی ئیشەکە بە پێچەوانەوە وەستایە، واتا: ئەوان غەریبانە دەستیان لە ئێمە ستاندووەو بوونەتە خاوەن ماڵ و ئێمەش بووینەتە میوان! بۆچی و هۆی چی یە؟ کاتیٚ دەمانگووت ڕاستە فارس و عەرەب و تورك ڕێگەی دروست کردنی دەوڵەتیان لیٚ گرتیین کە ئەو سیٚ گەلە هەرسێکیان لە خاکی خۆیان دەوڵەت بوون و خاکی کوردستان بەبۆشی مابێتەوە لەسەر فەرمانی خوا یا هێزێکی ئەرزی یەکجار زل بۆ ئێمەی هێشتبێتەوە تا ئێمە لە ئاسمان دادەبەزین یاخود لەنێو سکی زەوی دێینەدەر و بڵاوەی لیٚ دەکەین لەسەر ئەو پارچەی زەویەی بۆمان تەرخان کراوە کە کوردستانێکی گەمارۆ دراوە بەو سیٚ گەلە ئەوسا بەر لەوەی بەخۆمان ڕابگەین دەستمان بەسەردا داگرن، ئەوسا دەمانتوانی بڵێین فارس و تورك و عەرەب لیٚ نەگەڕاین کورد بۆخۆی دەوڵەتیٚ دروست بکا، بیٚ گومان ئەو حاڵەتە سەیر و بیٚ ماناو دوور لە عەقڵ و مەنتیق و واقیع هەرگیز ڕووی نەدایەو ڕوونادا کەواتە هۆی مانەوەمان بە زەلیلی چی یە؟

ئەوخوڕەوشتە سروشتی یە خراپ و بەدانەی کە هەمانە لەبەرامبەر یەك وای لێ کردووین کە هەمیشە خۆمان لە بێگانان بەکەمتر بگرین و هەویرێك بێن بەکەیفی خۆیان قەرەقۆز و شەمولەمان لێ دروست کەن، لەبەرامبەر یەکتریش وەك دوو پارچە پۆلاّی یەك کێش و یەك قەبارەی ڕەق لەیەکتری بخشێین تا هەردوو لا دەبینە تۆز و ڕەشەبا دەمان بات .

لەو هۆیانەی کە باوە لە نێو خەلّکی کوردەواری کە گوایە لێ نەگەڕایە کورد ببێ بەدەولّەت هۆی جوگرافیە ، جوگرافیای کوردستان جوگرافیایەکی داخراوە واتا لەهیچ لایەکەوە نەکەوتیتە سەر دەریاوە، دوژمنانی کورد وایان لە کورد کردیە کە بەتەواوی قەناعەتی بێ کە نەبوونی لایەکی خاکی کوردستان لەسەر دەریا وای کردیە کە هەتا هەتایە کورد نەبێتە هیچ و هەر بە ژێر دەستی بمێنێتەوە و بێ لە دامەزراندنی دەولّەتێکی کوردی نەکاتەوەو ژێر چەپۆکی و کۆیلایەتی پیشەی بێ و خاکەکەی بە پارچە پارچە کراوی بمێنێتەوە و خێرو بەرەکەتی کوردستان داگیرکەرانی فارس و تورك و عەرەب دەستی بەسەر دابگرن و هەموو ویستێکی خۆیان بەسەردا فەرزکەن .

من نالّێم هەلکەوتنی نیشتمانی هەر گەلێ لەسەر دەریا هۆکارێکی کاریگەر نییە لە دروست کردنی دەولّەت ، بەلاّم نەبوونی ئەو هۆکارەش هەرگیز هیچ گەلێ لەدروستنی دەولّەتێکی سەربەخۆ دوورناخاتەوەو وورەی پێ بەرنادا، چونکە وا بەچاوی خۆمان دەبینین زیاتر لە پازدە دەولّەت لەسەر نەخشەی جیهانی وەکو کوردستان سنوریان داخراوەو لە هەموو لایەك گەمارۆ دراون بە ناحەزیان و دوورن لە دەریا لەگەلّ ئەوەشا سالّەهای سالّە دەولّەتی سەربەخۆن، وەك دەولّەتانی (چیك، سلۆڤاکیا، سویسرا، نەمسا، هەنگاریا) لە ئەوروپا ، وە ئەفریقیای ناوەند و تشاد، ڕودیسیاو مەلاوی لە ئەفریقا ،وە پاراگواو بۆلیڤیا لە ئەمریکای باشور وە ئەفغانستان و مەنغۆلیا لە ئاسیا.

باشە بۆ هەڵکەوتنی ئەو دەوڵەتانە لە نێو خاکێکی داخراو گەمارۆ دراو بە دوژمنان و ناحەزانیان و دوور لە دەریا سەربەخۆیی لە کیس ئەو دەوڵەتانە نەدایە بۆ بەتەنها لەکیس کوردی دایە هەروەك لە پێشتر گووتم ئاینی ئیسلام بۆ بەتەنها دەوڵەتی لە کیس کورد دایەو لەدەست دەیان گەلانی تری نەدایە؟ خۆ ئەو ڕاستیە واقیعیە بەرچاوە ئەو بیرو ڕایەش بەدرۆ دەخاتەوە کە دەڵێ؟ هەڵنەکەوتنی خاکی کوردستان لەسەر دەریا دەوڵەتی لەکیس داوین و لێ نەگەڕایە ببین بەدەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ.

دەبا لێرەدا بگەینە ڕاستی و خەریکی دۆزینەوەی ئەو ڕاستی و هۆکارانە بین کە بووینە بەربەست لەپێش نەهاتنەکایەوەی ئەو دەوڵەتە

ولاّتی مەنغۆلیا ( ولاّتی جەنگیزخان و هۆلاکۆ) کە وەك بیابانێکی چۆڵ و گەرم لە میانی دوو دەوڵەت لە هەرە دەوڵەتەگەورەکانی جیهان هەڵکەوتووە، کەچی نەك بەدرێژایی مێژوو سەربەخۆ بووەو ئێستاش هەر سەربەخۆیە لە سەدەکانی ڕابردوو سێ ئیمپراتۆریەتی یەکجار زلی لەسەر نەخشەی جیهان ڕەش کردەوە بەسەرۆکایەتی جەنگیز خان و نەوەکەی (هۆلاکۆ) ئیمپراتۆریەتی فارسی و چینی و عەباسی و ئیمپراتۆریەتی چوارەمیشی خستە گەورەترین مەترسی کاتێ (تەیمور لەنگ) توانی سوپای عوسمانی بە سەرۆکایەتی (سولتانەکەی – سولتان بایەزید) بشکێنێ و سولتان بە خۆیی و بەژنە (صربەکەی – گالیسیا) بەدیل بگری و بەڕووتی سەمای پێ بکا لەبەرچاوی سولتان ، تا سولتان لەداخا گیانی دەرچوو (الفتوحة الاسلامية) (مفتي ديار مكة) الجزء (٢) (الشيخ أحمد الزيني دَحلان) ١٣٥٤هـ .

نازانم ئەو مەغۆلیانە ئەو هەموو ئازایەتی و زانایی و پشوەیان لەکوێ هێنا لەو ولاّتی ئیشك و برینگ و هەژار و گەرماو دارو بەدوو دەوڵەت لەهەرە دەوڵەتە گەورەکانی جیهان (ڕوسیا و چین) ئەو هەموو هێز و دەسەلاّتەیان لەکوێ هێنا لە

ولاته هه‌ژاره که یارمه‌تیان بـدا بـۆ ڕه‌ش کردنـه‌وه‌ی سـێ ئیمپراتۆریـه‌ت ؟ سـێ ئیمپراتۆریه‌تی چۆن؟ هه‌تا بلێی

دەوڵەمەند و پێـشکەوتوو لەهـەموو بوارەکـانی ژیـان لـە سـەردەمی خۆیـان؟ بەڕووداوێکی مێژوویی یەکجار سەیر دەژمێردرێ و جێگەی سەرسـوڕمانە، ئـاخۆ دەبێ هۆی سەرکەوتنی مەغۆلیان بەسەریان چی بێ؟ ئایا ئەونهێنیانە چینە ئـەو دڕندانەی سەرخـست بەسـەر ئـەو سـێ شارسـتانیە بەناوبانگـەی جیهـان؟ ئـەو پرسیارانەو چەندان پرسیاری دیکەش لەو بـارەوە پێویـستی بـە وەڵامـە، وابـزانم دانەری کیتابی (أعصار من الشرق) وەڵامی داوەتەوە، ئەوەی دەیـەوێ بیزانـی بـا ئەو کیتابە بخوێنێتەوە کە دانەری ئەفسەرێکی میسریە.

لێرەدا با بگەڕێینەوە سەر مەسەلەکە خۆمـان و بـزانین ئـەو هۆیانـە چـنەو چەندە کە پێشگیریان لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی کردیە.

# بۆ تا ئێستا خاوەن دەوڵەت نین؟

من کە کوردێکی تەمەن شەست ساڵەم و لە نێو جەرگەی کوردستانی گەورەدا دەژیم کە شاری کۆیەیەو سەدا نەوت و شەشی ئەو ماوەیەم لەوشارە خۆشە ویستەم بەسەر بردووە ، بەپێویستی دەزانم بەو ڕادەیەیی کە خوای گەورە پێی ڕازیە شانازی بە کوردایەتی خۆم بکەم و خۆم بە کوردێکی نەژاد کورد بزانم و حاشا لە نەژادی خۆم نەکەم ، چونکە حاشا کردن لە نەژاد و ڕەچەڵەك یەك لەو گوناهانەیە کە خوای گەورە پێی ڕازی نییە وەك پێغەمبەری گەورەمان

( علیه الصلاة والسلام ) دەفەرموێ: (مَنْ آدعی الی غیر أبیه أو أنتمی الی غیر موالیه فعلیه لعنة الله والملائکة والناس أجمعین لایقبل الله منهُ یوم القیامةِ صرفاً ولا عدلاً ). رواه الشیخان ، الزواجر عن اقتراف الکبائر، الجزء الثاني ص٥٨ الطبعة الأولی ١٣٧٠ هـ ، ١٩٥١ م

زۆر بە پێویستی دەزانم وەك کوردێکی نەژاد کورد کە گەلی کورد لە بێگانان چاکتر بناسم و شارەزایی پترم پێی هەبێ لەهەر جۆرە بێگانەیەك و لە هەموو بێگانان چاکتر خاڵە لاوازەکانی بدۆزمەوەو بەخۆمانی بناسێنم ، نەك بێگانەیەك لە دووری هەزاران کیلۆمەترەوە بێ نەزمانی لەگەڵ ئێمە یەك بێ نە تایین و نەمێژوو نە داب و دەستور و سیفەت و سروشت هەستی کورد بەخۆی بناسێنێ و بەهەزاران و دەیان هەزارانیش چی فەرموو بۆی بسەلمێنن. بەڕاستی عەیبێکی یەکجار گەورەیە گەل بۆخۆی نەناسی و چاوەڕوانی بێگانان کا کە خۆی پێ بناسێنن، چونکە ئەو حاڵەتە گێل و وێلی و دواکەوتوویی ئەو گەلە بەجیهان نیشان دەدا، لەو حاڵەتەدا کە کابرای بێگانە زانی ئەو گەلە تا ئێستا خۆی نەناسیوە شتی وای دەداتە پاڵ یاخود عەیبی وای دەداتە پاڵ کە لێی بێ بەریەو دوورە لەو جۆرە عەیب و کەم و کوڕیەی کە ئەو بێگانە بۆی هەڵبەستووە.

گەورەترین عەیب و کەم و کوڕیمان لە دونیا بەدرێژایی مێژوو ئەوەیە کە تاکە گەلێن خاوەنی دەوڵەت و سەربەخۆیی خۆمان نین لەگەڵ ئەوەش کە ژمارەمان بە دەیان ملیۆنەو خاوەنی نیشتمانێکی بەرفراوانین کە ڕەنگە لە چوار سەد هەزار کیلۆمەتر دووجا پتر بێ و لە مێژوو گەلێکی بە قووڵ دا چووینە خوارو خاوەن زمانێکی پاراو و خۆش و دەوڵەمەند بەوشەی جوان و ڕێزمانێکی بێ گەرد ، لەسەر هەمووشیانەوە سوپاس بۆ خوا موسڵمانین و تاکو ئەوڕۆش لە چەندان گەلی موسڵمان زیاتر دەستمان بە ئاینکەمانەوە گرتیەو لێی هەڵنەگەڕاینەوە و هەر لەسەرەتاوە بەبێ کوشت و کوشتار موسڵمان بووینەو ئەگەر چی باب و باپیرانمان بۆ ماوەی چرکەیەکیش کەسیان پێغەمبەریان ( علیه الصلاه والسلام ) نەدیوەو لەسەردەمی خەلیفەی دووەم (عومەری کوڕی خەتاب) خوا لێی ڕازی بێ مووسڵمان بوینەو دوای مردنیشی خوا لێی ڕازی بێ کەس نەیبیستوە یەك تاکە کورد لە ئاینکەی هەڵگەڕابیتەوە ، نەك هەر لێی هەڵنەگەڕایتەوە بەڵکو بەماڵ و بەگیان بەرگری لێ کردیە و سوپاس بۆ خوا ، لەجاری دووەم دا شاری قودس لەسەر دەستی سەرکردەیەکی کورد ( صلاح الدین الایوبی ) ئازاد کرایە، بە پێچەوانەی قوڕەیشیەکان و عەرەبەکانی نیمچە دوورگەی عەرەب کە بیست و سێ ساڵ بە هەموو توانایانەوە لە دژی پێغەمبەر جەنگان ئەگەرچی پێغەمبەر ( علیه الصلاه والسلام ) لەنێو جەرگەی قوڕەیش هاتبووە سەردونیاو وەك خۆیان عەرەب بوو ، هەروەها قورئانی پیرۆزیش بە زمانی خۆیان دابەزیوە ، وە لە دوای کۆچی دواییشی ( علیه الصلاه والسلام ) بەدەیان هەزار عەرەب لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە و هەموومان (حروب الرده) دەزانین و ئاگادارین و چەند هەزار صەحابەی تیا شەهید کرا ، ڕەزای خوایان لێ بێ .

هیچ موسڵمانێك و هیچ گەلێکی موسڵمان نیەو لە دونیا نابێ و نەبووە کە کەم و کوڕی و عەیبی لەبەرامبەر ئاینی ئیسلام نەبێ تەنها پێغەمبەر نەبێ

(علیه الصلاه والسلام ) که به ئیزنی خوا بێ خەوش و بێ کـەم و کـوڕی بـوو ، ئێمەی موسڵمانی کوردیش وەك هەرگەلێکی موسڵمان کەم و کـوڕی و خـەوشمان لەبەرامبەر (ئایینـە پیرۆزەکـەمان ئـاینی ئیـسلام) زۆرە ، بـەڵام لەگـەڵ یـەك جیاوازی لەگەڵ گەلانی موسڵمانی دیکە، زۆربەی کەم و کوڕی و خەوشـەکانمان ( عەیبەکانمان ) ناگەڕێتەوە بۆ زاتی ( الذات ) گەلەکەمان ، بـەڵکو هـۆی هـەرە سـەرەکی کـەم و کـوڕی و خەوشـانەمان دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەر شـانی گـلاوی تاغوتەکانی فارس و تورك و عەرەب کە لە دواتر باسـی لێـوە دەکـەم و ئێـستا دەگەڕێمەوە بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو هۆیە زلەی کە لێی نەگەڕاوە ئێمەی موسڵمان کوردبین بەخاوەن دەوڵەت . بەلای منەوەو بەلای هـەزاران و دەیـان هـەزارانی وەك من و لەمن بە پشتەوەتر لەزانایی و لە ئەزموونی ژیان و بەساڵادا

چووتر هۆی هەرە سەرکی مانەوەمان لە ژێر چەپۆکی و مل کەچی و ماڵ وێرانی خۆ خۆریە، تەنهاو تەنها ئەو خۆخۆریە کە نەیهێـشتووە ڕۆژێـك لـەڕۆژان خۆمـان بەتـەبایی و یـەك پارچـەیی ببیـنین ، مێـژووی ئـەو چـەند سـاڵەی کـەوا لـە (شەرەفنامە) نووسراوەتەوە هەروەها شیعرەکانی (ئەحمەدی خانی و حـاجی قـادر) شاهیدی یەکجار ڕاستن لەسەر ئەو ڕاستیە، لەوانەش ڕاستر ئەو واقیعەیـە کـە وا من بۆخۆم شەست ساڵە تێیدا دەژیم و بەچاوی خۆم دەبینم سروشتی هەرە خراپ و گەورەمان خۆ خۆریە ، ئەوڕۆش ئەو خۆخۆریە لەهەموو سەروەختێك زیـاترە چ لـە میانی گروپە سیاسیەکان کەوان بەدەیان ساڵە لە شەڕدان لەبەرامبەر یەکتر وە چ لەنێوان زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی گەلەکەمان مەگـەر (الا مـن رحـم ربـي) سورە هود، حەسـودی بـردن بەیـەك سـیفەتێکی یـەکجار ڕەگ قـوڵ و ڕیـشاڵ داکوتراوە لەنێو دڵ و دەروغمان، کەیفمان بەخۆشی یەکتر نایەت هەمیشە حەز بـە ناگوزوری و ناخۆشی و لێقەومانی یەك دەکەین ، کـورد گوتـەنی بـە ئێمـە بـی غەیری خۆمان نینۆکی نەبێ خوریشتی لەشی پێ داکەوێنی، بێگومان ئەو پەندە

به خۆڕایی له نێومان سەری هەڵنەدایە، هەڵبەت سیفەتی حەسودی لـە نێومـان دروستی کردیە، هەر ئەو حەسودیە کە بەبـەردەوامی حیقـد و ڕق و کینـەی لـە نێومـان دروست کردیە، هەر ئەو حەسودیەیە کە سیفەتی تەکەبورو لووت بـەرزی لەبەرامبەر یەك دروست کردیەو ڕەگی لـە نێومـان داکوتایـە. حەسـودی هێنـدە سیفەتێکی خراپە وەك زانایانی ئیسلام دەڵێن هـەر حەسـودی بـور شـەیتانی لـە بەهەشت دەرپەڕاندو وای کرد کە تەکەبورو لووت بـەرزی بیگـری لـە بەرامبـەر ئادەم ( علیه السلام ) کاتێ کە خوای گەورە فەرمانی پێکرد سوجدە بەرێ بۆی و وتی سوجدەی بۆ نابەم ،چونکە من باڵاترم لە ئـەو ، ئـەوت دروسـت کردیـە لـە قوڕێکی بۆگەن و منت دروست کردیە لە ئاگرێکی بێ دوکەڵ (خلقتني
من نار و خلقتهُ من طين) ئـەنجامی ئـەو حەسـود هەڵبردنـە بـە ئـادەم ( علیـه السلام) چی بوو؟ دەرکردن بوو لەبەهەشت بە زەلیلی و سەر شۆڕی (قالَ فـأهبط منها فما يكونُ لك ان تتكبر فيها فأخرج إنك من الـصاغرين) الأعـراف (١٣ ) کەواتە حوکمی خـوای گـەورە وایـە کـە لـووت بـەرزی دەبـێ لـووتی بـشکێ و سەرشۆڕانە ژیان باتە سەر. کەواتـە بـێ شـك ئـەنجامی مـسۆگەری حەسـودی و تەکـەبور و لـووت بەرزیـە لەبەرامبـەر یـەك سەرشـۆڕی و زەلیلـی و ڕیـسوایە لەبەرامبەر خوای گەورە لە پێشەوە وە لە بەرامبەر دوژمنـان لە دواتر.

هیچ گەلێك نیە لە دونیا وەك گەلی کورد خـۆی بـە بـچوك و زەلیـل و کـەم بزانی لەبەرامبەر هەر جۆرە بێگانەیەك هەرچەندە کـافر و بیـژو نـەزان بـێ. لـە ئەنجامی ئەو حەسودی و تەکبورە لەبەرامبەر یـەکتر بەهاسـانی بووینـە بێگانـە پەرست زۆربەبێ شەرم و بێ ئابروو کرنۆشی زەلیلیـان بـۆ دەبـەین و یـەکجار بـە چاوێکی زل سەیریان دەکەین لە هەمان کاتدا یەکجار بە چاوێکی سووك سـەیری خۆمان دەکەین و خۆمان لە ئاستیان بە مرۆڤ نازانین و وا تێدەگەین خوای گەورە ئێمەی بۆ نۆکەری بێگانە دروست کردیە. بێگانە پەرستی و خۆ بەسـوك و چـروك

زانین لەبەرامبەر بێگانان سروشتێکی یەکجار بەهێزەو ڕەگی وەك کارپوش لەنێو دڵ و خوێن و گۆشت ئەندامەکانی لەشمان دا کوتایە، ئەو سروشتە بوویتە خاڵێکی لاوازی یەکجار کوشندە و ئاشکرا لە بێگانان، لەبەر ئەوە بێگانە بێ ئەوەی خۆی ماندوو کاو قوربانیەکی زۆر ببەخشێ توانیویەتی ولاتمان داگیر بکا و خوێنمان فڕبکا

(شەرەفخانی بەدلیسی) دانەری کتێبی شەرەفنامە لە ساڵی (١٠٠٥ )شاهیدە لەسەر ئەو ڕاستیە، شەرەفخان لە باسی باپیرە گەورەی دەڵێ: (باپیرە گەورەم جاشی تەیمور لەنگ بووە ، کاتێ کە تەیمور لەنگ

بەناوچەی بەدلیس دا تێدەپەڕێ ڕوو لە باپیرە گەورەم دەکاو پێی دەڵێ: فلانی ئەو ناوچەیە چەند ناوچەیەکی ئیستراتیجیە لە لایەنی سوپایی خۆزیە قەلاتێکی منی لێ هەبا، باپیرە گەورەم دەڵێ: جەناب هەموو پێداویستیەکم بۆ دابین کە من قەلاتێکی ئەو تۆی لێ دروست دەکەم بە زاڵمی وەك تۆ بەساڵێك نەگیرێ . تەیمور دەڵی زۆر چاکەو دەستی پێ بکە . دوای ئەوەی قەلاتەکە تەواو دەکا خۆی و چەکدارەکانی ، کە بێگومان کورد بوون خۆی لە ناو ئەو قەلاتە عاسێ دەکاو لە تەیموری لەنگ هەڵدەگەڕێتەوە ، تەیمور بە ناچاری بۆ ماوەی ساڵێ گەمارۆی دەداو ناتوانێ داگیری کا ، بەناچاری بار و بارخانەی خۆی تێك دەنێ بە جێی دەهێڵێ، دوای ئەوەی کە بەتەواوی هیوا بڕاو دەبێ دەستی بەردەبێ لە داگیرکردنی، کاتێ کە مەسافەیەك دوور دەکەوێتەوە باپیرە گەورەم دەرگای قەلاتەکە دەکاتەوەو بەدوای دادەچێ و بانگی دەکاتەوە و پێی دەڵێ: (گەورەم پێم نەگۆتی کەلەو ناوچەیە قەلاتێکی هێند هەڵەموت دروست دەکەم کە بەزاڵمی وەك تۆ بەساڵێك نەگیرێ ، ئەوە قسەی خۆم بردە سەر، ئەگەر نا هەر ئاڵقە بەگوێی خۆتم)!!

سەیری بێگانە پەرستی چۆن پیشەی گەورەکانی ڕابردوومان بووە ، لێرەدا ئەمن هیچ عوزر و پاکانەیەك بەو خائینە خۆفرۆشە نادەم لەسەر ئەو خیانەتەی

که ئەنجامی دا لەبەرامبەر کورد ئەگەر هەموو دونیاش عوزری لیٚ قبوولٚ کا مـن لێی قبولٚ ناکەم ، چونکە خیانەت و خۆفرۆشی تاوانێکە هەرگیزاو هەرگیز نـابێ بکرێ لەژێر هیچ گوشار و پەرت و بیانگەیـەك و بـارو دۆخێـك ، بـەلای منـەوە هەموو خائینێك مافی ژیانی نیەو نابێ مـافی ژیـانی هـەبێ بەتایبـەتی ئەگـەر خیانەتەکەی کارەساتێکی لیٚ دروست بـوو یـا بـووە هـۆی کوشـتن و لـەناوبردنی کۆمەڵێك لەبێ تاوانان (إنَّ اللهَ لايحِبُّ كلَّ خوانٍ كفور) الحـج . وە هەرکەسـێکیش داوای لیٚ خۆش

بوون و بووردن بۆ خائینان و خۆفرۆشان بکا خۆی خائینە ئەگەر نـا بـەو تاوانـە هەڵناستێ .

حەسودی و بێگانە پەرستی وای کردیە کە ئەگەر میرێك لە میرەکـانی کـورد تێکۆشابێ بۆ دروست کردنی دەوڵەتێکی کوردی و لـەمیرەکانی ترمـان بـەهێزتر بووبێ ڕووبەری میرنشینەکە لە هی ئەوانی تر بەر فـراوانتر بـوبێ ئـەوە یەکـسەر وەك ( مێژووی کورد و کوردستان - محمد امـین زکـی بـەگ) باسـی لێـوە دەکـا یاخود (شەرەفنامە) ، بە میرەکانی دیکە پاڵیان داوەتە سوڵتانی عوسمانی داوای چەك و سوپاو یارمەتیان لیٚ کردیە و بە هەموویان لـەناویان بـردووە، (عزالـدین شێری بەدرخان) سەرۆك لەشکری بەدرخانیەکان کە ئامۆزای میری بەدرخانیەکان بوو لە کوردستانی باکوور شاهیدی ئەو ڕاستیەن .

لەبەر حەسودی و بێگانە پەرسـتی ، هـەرگیز تـەبایی و یـەك پارچـەیی و برایەتیمان بەخۆمانەوە نەبینیوە ، سبحان الله هەموو شتێك شازی هەیە واتا لـە ڕیز دەرچون یا بیژۆك وادیارە لە نێو گەلانیش ئێمە شـازین و بیـژۆکین و لـەڕیز دەرچووین لە ڕووی یەکگرتن و خۆ ویستی و بێگانە پەرسـتی و هـەر بۆیـە کـە خاوەن دەوڵەت نین لەگەلٚ ئەوەش هەموو هۆکارەکـانی دامەزرانـدنی دەوڵـەتێکی کورد لە کوردستان بە زیادەوە لە کوردستان هەیە بە فرەیی .

ڕاسته گەلانی جیهان ڕۆڵەکانیان لەبەرامبەر یەکتر ناتەبا بوونە ، بەلاّم کاتێ دوژمنێکی دەرەکی شالاّوی بۆ هێناون یاخود تەنها ترسیان لێ نیشتووە لەبەرامبەری ناتەبایی و دووبەرەکیان بەلاوە ناوەو بوونەتە یەك پارچە پۆلای دارێژراو و بەرەنگاری دوژمنەکانیان بوونەوەو لەناویان بردینە و دەرسێکیان داون کە هەرگیز لەبیری نەکەن .

بەلاّم ئێمەی موسڵمانی کورد هیچ مەترسیەکی دەرەکی سوودی بۆمان نەبووە نەك هەر نەی کردینە یەك پارچە ، بەڵکو ناکۆکی و دووبەرەکیەکەمان زیاتر بووە ، لەو پەنجا ساڵەی دوایی هەمووومان ئەو حاڵەتە ترسێنەرەمان بەچاوی خۆمان دیوە ، لە ڕەوشتە ناشیرین ترسناکەکانمان کەشخەو لووت بەرزی بەسەر یەکتری لێ دەدەین فێری بێگانانیش دەکەین کەشخەو لووت بەرزیمان بەسەر لێ دەن ، لەبەرامبەر یەك تابلێی سوورین لەسەر هەڵە ، هەڵەش بۆ دوژمنانمان دەسەلمێنین و بەڕاستی دەزانین ڕق و کین گەورەین بەرامبەر یەکتری سەلامەت و دەستەمۆین بەرامبەر دوژمن ، تاڕادەیەکی یەکجار گەورە خۆ پەرستین( أنانی) بەجۆرێك هەموو گەل و نیشتمانمان بەقوربانی خۆمان و بەرژەوەندی خۆمان دەکەین لەو لایەنەوە بە پێچەوانەی هەموو گەلانی جیهانی ن، گەلانی دیکە هەموو شتێك بە قوربانی گەل و نیشتمان دەکەن ، بەلاّم گەل و نیشتمانیان بە قوربانی هیچ شتێك ناکەن . لە هەموو شۆڕشەکانی کورد هەر سەرکردەیەك لەسەرەك شۆڕشەکە زویر ببێ یان زویریان کردبێ یەکسەر دەستی خیانەتی گرتیەو ئارامی نەگرتیە لەسەر دابەزاندنی پایەو پلەی لە نێو شۆڕشەکەی ، کەچی لەوانەیە هەندێکمان ئەو بەسەر هاتەی (خالید کوڕی وەلیدمان) بیستبێ لە گەرمەی شەڕی ڕۆمەکان لە دژی ئیسلام و سوپای ئیسلام خەلیفە( عومەری کوری خەتاب ) نامەیەکی نارد بۆ یەکێ لەسەرۆکەکانی ئەو شەڕە کە تیای دا هاتبوو: خالید چیتر نابێ سەرکردایەتی ئەو شەڕە بکا و فلاّن کەس دەبێ جێگەی بگرێتەوە ، بەلاّم ئەو

صەحابەی کە نامەکەی پیٚ گەیشتبوو نامەکەی وەخراند و تەیدا بە خالید ڕەزای خوای لەسەر بیٚ تا شەڕەکە کۆتایی هات نەوەك لە مەعنەویاتی و ورەی خالید دابەزێنیٚ کاتیٚ کە شەڕەکە الحمد الله بەسەرکەوتنی موسڵمانان و صەحابە ڕەزای خوایان لیٚ

بیٚ کۆتایی هات و نامەکەیان پیٚداو خوێندیەوە ، خالید تووڕە بوو گووتی بۆ لەکاتی شەڕکە ئەو نامەیەی (میری موسڵمانانان – عومەری کوری خەتاب ) ڕەزای خوای لیٚ بیٚ پیٚنەدام تا چاتر و دلێرانەتر بجەنگێم لەبەرامبەر کافرانی ڕۆم؟!! شایانی باسە خەڵك زۆر باسی خالیدیان دەکرد بە ئازاو دلێر و چاپوك و نەترس لە جەنگا ، ناوبانگی بەو شێوە دەرکردبوو ، عومەری کوری خەتاب ڕەزای خوای لێبیی پیٚی وابوو کە ئەو ناوبانگ دەرکردنەی خالید لەخۆی دەگۆڕیٚ و لە خۆبایی دەکا بۆیە لەگەرمەی جەنگا لەسەرکردایەتی خست ، بەلاٚم خالید ڕەزای خوای لیٚ بیٚ لەوانە نەبوو ناوبانگ و شوهرەت کاری تیٚبکا ، وە لەوانەش نەبوو کە دوور خستنەوەو پایە دابەزین ورەی پیٚ بەرداو بیر لە خیانەت بکاتەوە ، بەلکو زیاتر سووربوو لەسەر بەرگری کردن لە حەق و لە بەرنامەی پیرۆزی ئیسلام

بیٚگومان ئەو حاڵەتەو ئەو ڕەوشەی کە ئێمەی کورد دووچاری بووینە کە ئەویش هەڵکشاندنی بەرژەوەندی خۆمانە بەسەر بەرژەوەندی گشتی (إيثار المصلحة الذاتية على المصلحة العامة) تەنها بە ئیسلام چارە دەکریٚ ، بە ئیمانێکی یەقینی وەك ئیمانی (خالیدی کوری وەلید) ڕەزای خوای لەسەر بیٚ ، هەرکاتیٚ زانیمان کە ئەو تاوان و گوناهەی کە دەیکەین لە پیٚناو سوودی ژیانی دونیا عەزابێکی ئەبەدی بەدواوە دیٚ لە ڕۆژی دوایی ، ئیتر هەرگیز تخونی ناکەوین ، بەو چەشنە چاکساز دەبین و دێینە سەر ڕێگەی ڕاستی خوا ئەوسا ڕزگارمان دەبیٚ لە هەر سوکایەتی و ڕیسوا بوونێك کە لە دونیادا هەیە.

گاوڕ بە گاوڕایەتی خۆی سەر و ماڵی بەقوربانی گەل و نیشتمانەکەی دەکـا ، ئەوتا لەدوای کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم کە ئەڵمانیا هیتلەری تێـدا بـەزی و تێکشکا ، هەرچوار دەوڵەتە زلە سەرکەوتووەکە ( ئەمریکا
، ڕوسیا ، بەریتانیا ، فەرەنسا ) بەدوای زانایـەکی ئەنـدازیاری فڕۆکـە شـەڕکەری ئەڵمانیدا دەگەڕان ، کاتێ ئەمریکیەکان دۆزیانەوە سەیریان کرد وا هەموو لەشی لە قوڕو چڵپاو ئاڵاوە لەو کاتەدا پێیـان گـووت: هەرچیەکت دەوێ بـۆت ئامـادە دەکەین بە هەزاران دۆلار و هەموو پێداویستیەکان ژیانت لە خزمەت دایە ئەگەر جەنابت بێی فڕۆکەی شەڕکەرمان بۆ دروست کەی ؟! ئەندازیاری زانا بـە جـواب هات و گووتی: تا دوێنێ ئـەڵمانیا لـە جـەنگ دابـوو فڕۆکـەی شـەڕکەری پـێ دەویست و منیش بۆم دروست دەکرد ، بەلام ئەوڕۆکە ئەڵمانیا کاول و وێران بـووە کۆریتە خانووی پێ دەوێ وا من ئێستا کۆریتە خانووی بۆ دروست دەکەم ، ئامادە نیم بە هیچ کلۆچێ ئەڵمانیا لەپێناو هیچ شتێ بەجێ بهـێڵم !! باوەڕکـە زۆریـەی کورد کەنگێ گەیشتە چلەو پۆپەی ژیانی ماددی ئەوسا خۆی بەهـەرزانترین نـرخ دەفرۆشێ لەپێناو بەدەست هێنانی ماڵی دونیا ، لەپێناو بەرزیەکی خـەیاڵی کـە پێی وایـە حەقیقیـە ، بـەلام دوورە زۆر دوورە مـاددەی دەسـتی دوژمـن ببـێ بـە بەرزیەکی ڕاستەقینە هەر ئەو خەیاڵـە کوشـندەیە وای لێ کـردووین خۆمـان بـە قوربانی هەموو بێگانەیەك بکەین تەنها خۆمان بە قوربانی خۆمان نەکـەین وەك تێنو لەدوای سەرابەوە ڕادەکەین تا لە تێنان دەخنکێین!!!

زۆربەمان چڵکاو خۆریمان پێ لە پلاو و گۆشت و برنجی خۆمان خۆشترە ، هەر دەڵێی لە نێو (جیناتەکانی ویراسەمان) (الجینات الوراثیة) جینەیەك هەیە لەناو لەشی هەموو کوردێك تایبەتە بە بێگانـە پەرسـتی و خۆفرۆشـی کـە یەکـەمین سەرچاوەی لەناو چوونمانە ، تۆ سەیرکە لەدوای کوژانەوەی شـۆڕەکەی ئـەیلول لـە شەشی ئازاری ساڵی ١٩٧٥ بەسەدان هەزار کورد بوون بە چـڵکاو خـۆر جـاش و

خۆفرۆش ئەندامی بەناو بەرز لە نێو ڕیزەکانی حیزبی بەعسی کورد خۆر کە بەداخەوە زۆربەیان

خوێندەوار و خاوەن شەهادە و مامۆستاو پارێزەر و ڕۆشنبیر بوون ، جگە لەوانەی کە شۆڕشگێڕی ناودار بوون لەنێو شۆڕشەکەی ئەیلول ، بەبێ ئەوەی بەعس زۆری لێ کردبن و بەزۆر کاری خیانەت و خۆفرۆشی پێ ئەنجام دابن ، بەڵێ زۆرن فێڵ لە خۆیان دەکەن و دەڵێن لە ترسان و بەزۆر و لەژێر هەڕەشە و گوڕەشەیەکی زۆر توند و تیژ بووین بە بەعسی ، بەلاَم لە ڕاستی دا درۆ دەکەن و لەپێناو بەرژەوەندی ماددی و تەماعی دونیا بووبن بەبەعسی ، تا شۆڕشەکە لەباو بوو ببون بە پێشمەرگە و ئەندامی بەناو دڵسۆزی پارتی ، لە ڕاستیشدا هەر بۆ خۆ فەرزکردن و بەرژەوەندی ماددی و پایەو پلەی بەرز بەدوای ئەو شۆڕشە کەوتبوون، کاتێ ئەو ئامانجە تاکیانەیان لە شۆڕشەکە دەست نەکەوت بایانداوە سەر بەعسیایەتی ، بەڵکو لەو ڕێگەوە دەستیان بکەوێ ، ئەگەرنا بەعس کەسی بەزۆر نەدەکردە بەعسی ئەگەرچی هەوڵێکی زۆری دەدا بۆ بەعسکردنی کورد کە پێویست بوو کورد نەبێتە بەعسی ، چونکە حیزبی بەعس تایبەتە بە عەرەب (حزب البعث العربی الاشتراکی) ئەوە لە لایەك لە لایەکی تر بەعس لەیەکەم ڕۆژی دامەزراندی بڕیاری لەناو بردنی کوردی دایە و گووتویەتی :

**لاتقتلوا الحية والعقرب بل أقتل الكردي ولو إستعرب**

مارو دوپشك مەکوژە کورد بکوژە کەنگێ هەوڵی دا ببێ بەعەرەب ، ئەوەیە دروشمی ئەوەللو ئەخیری بەعس لەبەرامبەر بە کورد

ماوەی بیست و سێ ساڵم لەژێر ئاڵاو دڕندایەتی بەعس ڕابوارد بە مامۆستایی سەرەتایی لەوە ماوە دوورو درێژە عەجەب بەعسیەك نەهات داوام لێ بکا کە ببمە بەعسی لەکاتێکا لەبەرنامەی بەعس دا هەبوو کە مامۆستایان دەبوایە سەدی سەد بەعسی بان، عەجەب ئاخۆ دەبێ من لە هەموو کەس ئازاتر

بووبم کە نەبوومە بەعسی، یا لە قوتابخانەکانی کۆیە لـە هـەمووان شـاردراوەتر بووم ، یا لە هەموو کەس بە پشت و قەوەت تر بووم بۆیە خۆم ڕاگـرت یـا دەبـێ ئەو خەڵکەی دەڵێن کە زۆربەی ڕۆشنبیر بوون بەزۆر بووینە بەعسی درۆ دەکەن .

کاتێ کە کوردێـک دەبـووە بەعـسـی ، بـەعس زۆر چـاك دەیزانـی کـە ئـەوە کوردێکی لەکۆڵ بووەو کوشت ، ئەوسا لە دوای نـەمانی حکومـەتی بـەعس لـە زۆربەی کوردستانی باشوور لە ساڵی (١٩٩١) خەت مائیلیان ئیبداع کرد واتـا: ئێمە هەر بەفێڵ و سیاسەت ببوین بە بەعسی تا لەپەنا بەعسیایەتی کوردایەتی بکەین؟ ئەی ماشاء الله لەو کوردایەتیەی کە کردیان، گوایا نـەیان دەزانـی ئـەو قەسپەی ئەوان دەیخۆن دەنکەکەی نەك لە باخەڵی بەعس بوو بەڵکو لـە باخـەڵی کەسانی وەك من بوو، ئەگـەر (خـەت ماتـل) بـوون ئـەی بۆچـی بـەدەیان و بـە سەدانیان بەدەستی بەعس بە خنکاندن و ماڵ وێران کرد؟ ئەی بۆ لە دواتر سەدان ماڵە کوردیان تاڵان کرد لە شاری کەرکوك کە گوایـە (قودسـی کوردسـتان ) ە ئەی دواتر کە جێگەی خۆیان لە نێو دام و دەسـگاکانی مـیری گرتـەوە بـۆ تـاکو ئەمڕۆشی لەگەڵ بێ هەژارانی گەلەکەمان دەڕوتێننەوەو دەچەوسێننەوە و منالانی و ئافرەتانی باوك و مێرد ئەنفال کراو بـرین دەکوڵێننـەوە لـە بـرین کولانـەوەش زیاتریان بەسەر دەهێنن، جا خەت مائیلی ئەو هایەو خەت مائیل ئەوە هـەڵس و کەوتیەتی لەبەرامبەر لێقەوماوانی گەلەکەی؟

لەو سروشت و سیفاتانەی کە لێ نەگەڕایـە خـاوەن هـیچ بـێن سـاویلکەییە ، (سافیلکەیی) واتا خۆش باوەڕی و زوو فریـو خـواردن بـە فرتـو فیـڵ و پیلانـی دوژمنان و دوور کەوتنەوەمان لە شی کردنەوەو بیرکردنەوەی قووڵ دوور لە حالاتی عاتیفی. رابزانم هیچ گەلێك لە دونیا لـەڕووی سـافیلکەیی و خـۆش بـاوەڕی وەك ئێمەی موسڵمانی کورد نییە هەموو جاران لە بەرامبەر فرت و فێڵی دوژمنانمـان بە مستە ئاوێك کەوتینە

مەلـە، چـاکترین بەڵگـەو نـزیکترین بەڵگـە لەسـەر سـەپاندنی ئـەو ڕاسـتیە ڕێککەوتنەکەی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول بەرابەرایەتی (موستەفا بـارزانی) خوای لێ خۆش بێ ، لەگەڵ بەعسیە فاشستە کورد کوژەکان لـە یـانزەی ئـازاری ۱۹۷۰، مـن ڕەخنـەیان لێ نـاگرم لەسـەر ئـەو ڕێککەوتنـە بەتـەنها ، بـەڵکو ڕەخنەیان لەسەر ئەوە لێ دەگرم کە خودی ڕێککەوتنەکە هیچ بەندێکی ئەو و تۆی تێدا نەبوو کە کورد سوودی لێ وەرگرێ تەنانەت بۆ ماوەیـەکی کـەمیش ، تـاکو ئـەمڕۆ نوسـخەیەکم لـەو بەیاننامەیـە پاراسـتوە لـەو نوسـخانەی کـە هێلیکۆپتەرەکانی بەعس بەسەر شاری کۆیەدا بڵاویان کردەوە بـەزمانی عـەرەبی چاپ کرایەو من هەر ئەو کات خوێندمەوە گاڵتەم پێ هات و چی ئـەو و تـۆم لێ بەدی نەکرد وتم ئەو مافەی کە ئێمە لەسەر دەمی ڕژێمی پاشایەتی هـەمان بـوو گەلێ زیاتر بوو لەوەی کە لەو بەیانەدا هاتووە . لەیەکەم چـرکەی چـارپێکەوتنت بەو بەیاننامە پاش گەز بوونەوەی بەعست لێ بەدی دەکـرد، دەبوایـە لەسـەرەوەی بەیانەکە نوسرابا (ڕێکەوتننامەی ئـازار) نـەك ا بەیاننـامـەی ئـازار) ، چـونکە جیاوازیەکی یەکجار زۆر هەیـە لـە میـانی ئـەو دوو ووشـەیە، (ڕێککـەوتن) و (بـەیان) سـەرکردایەتی کـورد دەبوایـە یەکـسەر ئـەو شـتە ڕەت کاتـەوەو ڕێککەوتنەکە لەگەڵ بەعس هەڵوەشێنێتەوە تا لەسەرەوەی بەیانەکـە ڕازی دەبـوو بنوسێ(ڕێککەوتن نامە) وشەی ڕێککەوتن نامە هێز و سەربەرزی بـۆ کـورد دەبەخشێ ، مانای ئەوەیە کەبەعس دانـی بەشۆڕشـەکە داهێنایـە کـە هێزێکـی فراوانی کاریگەرە لە عێراق کە بەڕاستی پێی ترساوە یاخود لەبەری بەزییە بۆیـە لە گەڵی ڕێککەوتیە، بەڵام وشەی (بەیاننامە) ئەو مانایە دەبەخشێ کە بـەعس خێری پێ کردووین و بەزەیی پێمان داهاتیتەوە تۆزێك هەڵس و کەوتی خۆی

لەگەڵمان گۆڕیە لە خراپ بۆ چاك تا كاتی خۆی و بەرژەوەندیەكانی وا بخوازێ .

ئەگەر سافیلكەیی و خۆش باوەڕی نەبوایە هەرگیز شۆڕشەكەی ئەیلول دەگەڵ بەعس بەو بەیانە ڕازی نەدەبوو لەكاتێكدا بەعس ئەو پەڕی لاواز و بێ هێز بوو چ لەباری ئابووری و چ لە باری لەشكری و سیاسی ، چونكە هەموومان دەمانزانی قەلاچۆكردنی كورد لەبەرنامەی بەعس لە پێش هەموو بەندەكانی بەرنامەیەتی بەرپەری سوریەوە. كەواتە چۆن لەگەڵ حیزبێك ڕێك دەكەوی كە ئەوە بەرنامەیەتی و لە دوا ڕۆژێكی كورتیش ئیسپات بوو بۆ هەمووماندا كە بەعس هەرگیزاو هەرگیز لەبیری لەناوبردنی كورد یەك زەرە لا نادا

هەر هێندەی پێ نەچوو حكومەتی بەعس لە ڕۆژی (٢٩ / ٩ / ١٩٧١) گەورەترین و خوێناوی ترین پیلانی گێڕا بۆ كوشتنی (سەرۆك بارزانی) لە چۆمان پێشتریش لە( ئیدریس بارزانی كوڕی) لە ناوەندی شاری بەغدا، ئەگەر ساویلكەیی و خۆش باوەڕی نەبا دەبوایە ئەو ڕێككەوتنەی ئازاری ١٩٧٠ یەكسەر ئیلغاكاو دەست بەشەڕ كاتەوە، نموونەی مێژوویی دیكەش زۆرن لەسەر ساویلكەیی و خۆش باوەڕی كورد بە دوشمنانی، بەڵام ئەو نووسینە لەوە زیاتر هەڵناگرێ درێژبێتەوە.

## له ئامانجه‌كانی شۆڕشی ئه‌یلول

١- دیاری كردنی سنوری كوردستانی باشوور به‌و ئیعتبـاره‌ی كـه كـورد لـه خاكی كوردستان سه‌دان ساڵ به‌ڵكو هـه‌زاران سـاڵ بـه‌ر له‌عـه‌ره‌ب له‌سـه‌ر ئـه‌و نیشتمانه‌ی خۆی ژیاوه خوای گه‌وره پێی به‌خشیوه و پێ ڕه‌وا بینیوه كـه بێگومـان هه‌ر چـوار پارێزگاكـانی كوردسـتان ده‌گرێتـه‌وه (موصـل ، كـه‌ركوك، هـه‌ولێر، سلێمانی) .

٢ - داواكاریه‌كانی به پێی ژماره‌ی دانیشتوانی عێڕاق سامانی عیاق دیاری بكرێ ئه‌گه‌رچی ئه‌و سامانه زۆربه‌ی به شێوه‌یه‌كی سروشتی له كوردستانه .

٣- پێویسته به پێی ژماره‌ی دانیشتوانی عێڕاق ژماره‌یه‌ك وه‌زاره‌تی ده‌وڵه‌تی عێڕاقی بۆ دیاری بكرێ .

٤ - زانكۆ له كوردستان بكرێته‌وه به‌زمانی كوردی و زمانی كوردی شان بـه شانی زمانی عه‌ره‌بی له عێڕاق ڕه‌سمی بێ .

كه‌چی ئه‌و داواكاریه سروشتیانه هیچی له نێو ده‌قی به‌یانه‌كه‌دا نییه ته‌نها كردنه‌وه‌ی زانكۆیه‌ك له كوردستان و زمانی كوردیش ڕه‌سمی بێ .

ئه‌وه‌ی كه له به‌یاننامه‌كه‌دا هاتووه ده‌توانم بڵێم هیچ شتێكی ئه‌و تـۆی تێـدا نییه كه به داواكاری ڕاستی و سروشتی كورد بشێ وه‌ك ئه‌و كۆریته خانوانه‌ی كه لـه گونـده‌كانی كوردسـتان ڕووخـاوه لـه مـاوه‌ی نـۆ سـاڵ شـۆڕش هـه‌روه‌ها قه‌ره‌بوودانه‌وه‌ی (تعویض) ئه‌و مه‌ڕو بزنانه‌ی كه له ئه‌نجامی بۆردومان كـوژران یاخود حه‌ره‌س قه‌ومیه‌كانی به‌عس به تالآنیان بردیـه هـه‌روه‌ها عـه‌فوی گـشتی هه‌موو پێشمه‌رگه‌كانی كوردسـتان و دامه‌زرانـدنی وه‌زاره‌تێـك بـه‌ناوی وه‌زاره‌تـی ئاوه‌دانكردنه‌وه‌ی (شیمال) نه‌ك كوردستان ، وه ئـه‌نجام دانـی حـوكمی زاتـی لـه‌و شارانه‌ی نه‌ك كوردستانن، به‌ڵكو زۆربه‌یان كوردن كه بێگومان ئه‌و خاڵه‌ی دوایی فرت و فێڵێكی ئاشكرایه له كورد و سه‌ركردایه‌تی كورد . هه‌ر ئـه‌و به‌نـده بـوو كه حكومه‌تی به‌عس توانی زۆر به خێرایی زۆرینه‌ی ژماره‌ی كـورد لـه كـه‌ركوك

بکا بە کەمینەیەکی یەکجار بێ نرخ و بەزووترین کات شاری کەرکوك تەعریب و تەبعیس بکا بۆئەوەی هەرکاتێ کورد داوای کرد بڵێ: ئەوەتا لەنێو بەیانەکەدا هاتووە ، کە خۆتان مۆرتان کردیە کە حوکی زاتی تەنها بۆ ئەو شوێنانەیە کە زۆرینەی کورد نشینە، لەوەش گەورەتر و سەترسیدار تر ئەوەیە لەمەسەلەی حوکمی زاتی تەنها بۆ ئەو شوێنانەیە کە زۆرینەی کوردن ، کەواتە لە عێراق خاکێك نیشتمانێك نیە بەناوی کوردستان واتا بەعس بەر لە هەموو شتێ بەپێی بەیانەکە تەواو رێگەی بۆ خۆی خۆشکرد کە کوردستان لە عێراق نییە، هەمیشە نیازی وایە کە کوردستان بە عەرەب بکا بەیەکجاری بەپێی بەیانێك کە خۆمان مۆرمان کردیە، کە مادام لە عێراق خاکێك نیە بەناوی کوردستان کەواتە بەحوکومەتی بەعس مافی خۆیەتی کە لەبیابانەکانی رۆژئاوای عێراق نیشتەجێمان بکا و ئەوسا پێمان بڵێ حوکمی زاتی خۆتان لێرە تەمەتوع پێ بکەن و سوودی لێ وەربگرن .

مەسەلەی عەفوی گشتی ( لێبوردنی گشتی ) لە هەموو ئەو پێشمەرگانەی کە پێشمەرگە بووینە لە شۆرشەکەی ئەیلول ، ئەوە کەنگێن داواکاری گەلێکی چل ملیۆنیە؟ قەبوڵ کردنی (لێبوردنی گشتی) چ ماناو ناوەرۆکێك دەگەیەنی؟ بێگوومان من تۆ عەفوودەکەم و تۆش عەفووەکەم قبوڵ کەی مانای دانت بە تاوانی خۆت داهێنا لەبەرامبەر من ، سەرکردایەتی شۆرش بە قەبوڵ کردنی (لێبووردنی گشتی) کە بەندێکی سەرەکیە لەناو بەیانەکە ، هەموو پێشمەرگەکانی ئەو شۆرشەی تاوانبار کرد ئەوسا دەبێ سوپاسی حکومەتی بەعس بکەن کە لێیان خۆش بووە !!
کەنگێ رەوای حەقە ماف خوراوێك داوای حەققی شەرعی خۆی بکا بەتاوانبار دابنرێ !

مەسەلەی تەعویز ( تعویض ) قەرەبوو دانەوە ، مەرو مالآت و خانوبەرە رووخاوەکان و کاول کردنی گوندەکان و سوتاندنی ئۆتۆمبیلی هەژاران ، بێ

گومان مەسەلەی تەعویز بەهیچ کلوجێك ئەوە داواکاری گەلێکی ماف خوراو نیە و نابێتە داواکاری ، چونکە حکومەتی بەعس و حکومەتە یەك بەدوای یەك دا هاتووەکانی عێراق بەو تاوانە هەستاون و دەبێ تۆلەیان لێ وەرگیرێتەوە ، تۆلەدانەوە بەهیچ شێوەیەك مافی خوراوی کورد نیەو نابێ.

بەکورتی تێکرای بەیاننامەکەی ئازار هیچی ئەو ‌ تۆی بۆ کورد تێدا نەبوو، تەنها شتێکی ئیعلامی بوو بۆ ماوەیەك گەلەکەمانی بەنج کرد تا بەعس خۆی بەهێز کردەوەو پەیمانی برادەرایەتی و یارمەتی لە سالی (١٩٧٢) لەگەل ولاتی یەکێتی سۆڤیەت بەست و بەپێی ئەو پەیمانە سۆڤیەت لە دژی کورد هەموو جۆرە چەکێکی کوشندەی بە بەعس فرۆشت و حیزبی شیوعی لە شۆرش هەلگەراندەوەو بەرەیەکی نیشتمانی لە گەلا بەست لەهەمان سال، بەچەندان ئەندامی گەورەی لە نێو شۆرشەکە کری و یا کوشت و سوپاکەی بە تەواوی دروست کردەوەو ئەوجا شالاوی قەلاچۆکردنی بۆ هێناین و دا نەنیشت تا شۆرشەکەی تاراندەوە.

ئیتر رازی بوونی کورد یا سەرکردایەتی شۆرشی کورد تەنهاو تەنها سافیلکەیی و خۆش باوەری کوردی بە جیهان ناساند و ئەو سافیلکەییەی کە هۆکارێکی گەورەیە لە تەمەنی کورد لە نەبوونی دەولەتێکی کورد لە کوردستانی گەورە. ئەورۆش لە هەموو رۆژێك ساویلکە ترین ، چونکە زۆرینەمان وا تێدەگەن کە پێش کەوتووین لە بوارەکانی ژیان کەچی لە راستیدا و لە واقیعدا لە هەموو رۆژێك لە مێژوو دواکەوتوو ترو لاوازترین بەلام بە خۆمان نازانین زۆر بەداخەوە !!

هەموو دونیا دەیزانی ویستی بەعس لە رێگەی دەرچواندنی بەیان نامەی (١١/ ئازار/١٩٧٠) تەنها بۆ لەناو بردنی کورد بوو، بەلام الحمد لله ویستی خوا لەگەل ویستی بەعس نەبوو، بەلکو لەگەل ئەوە بوو کە کورد بمێنێ تا ئەو رۆژی ئەو بۆی دیاری کردیە ئەو رۆژەش بەکەس پاش و پێش ناکرێ.

## ئایا ئەو عەییە زلانەی ئێمە هەمانە گەلانی دیکە لێی خاوێنن؟

بێگومان نەخێر لێی خاوێن نیین، بەلاّم ئەو کەم و کورِی و عەیبانەی ئەوان هەڵبەت لە عەیب و کەم و کورپیەکانی ئێمە کەمترن ، لەبەر ئەوە کاریگەر نەبوە و کاری نەکردیتە سەر بەرەو پێشەوە چوونیان بەرەو دامەزراندنی دەوڵەت یاخود بەرەو پێشەوە چونیان لە هەر لایەنێك لە لایەنەکانی ژیان. فەرهەنگی زمانی هیچ گەلێك بەتاڵ نییە لە ووشەی حەسودی و لووت بەرزی و ساویلکەیی و خیانەت ، بەلاّم بەتەنها کورد لەو سروشت و سیفەتە خراپانە شاز و لە عالەم بەدەرە بۆیە بێ بەشە لەو مافەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوەو گەلانی دراوسێی لێیان ساندووە کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیە ، کە بێگومان دەوڵەتی سەربەخۆ بۆ هەر گەلێك لە نیعمەتە هەرە گەورەکانی خوای گەورەیە لەدوای بروای تەواو بە خوای گەورە بنەماکانی دیکەی ئیمان . گەل و مرۆڤ هەمیشە بە دەوڵەتەوە جوانن.سەربەرزن و بەرِێز و بەنرخ و بەسەنگن لە گۆشە نیگای هەموو گەلانی جیهان ، بەلاّم گەلی بێ دەوڵەتی سەربەخۆ بە پێچەوانەوە هەرچی نرخ بێ لێی بێ بەشە و بەڵکو هەندێ جار بە مرۆڤیش ناژمێردرێ و لەبەندەکانی سەردەمی یۆنان و رۆم سوکتر سەیر دەکرێ.

## ئایا دەردی ما بە چ چارەسەر دەکریّ؟

تاکە ڕێگەی ڕزگاری و سەرفرازیمان گەڕانەوەیە بۆ بەرنامە پیرۆزەکەی ئیسلام بە بڕوایەکی ئاودار و پـاراو بـە زانـین و زانیـاری نـەك ئیمـانێکی کوێرانـە، بـە ئیمانێکی یەقینی شۆڕبۆوە بەناو ناخی دڵ و دەروون، بەکورتی ئەو ئیمانەی خوای گەورە پێی ڕازیە، ئەو موسڵمان بوونەی کە خوای گەورە لێمانی دەویّ و پێی ڕازیە نەك ئەو موسڵمانەتیەو ئەو ئیمانەی کە خەڵك لێمانی دەویّ ، یاخود تاغوتـەکان لێمانی دەویّ و یاخود عەقڵ و هۆش و بیری کورت بـێن و بەهەڵەداچـوو لێمـانی دەویّ .

لە دونیا هیچ دەردێکی دەرونی و سروشتێکی بەدو ترسناك نییە کە مرۆڤ یا گەل فرتکی پیّ گۆڕاوە بە هیچ دەرمانێك لە یەخەی مرۆڤ یا گەل نابێتەوە تەنها بە ئیمانێکی یەقینی تەواو بە خوای گەورە لە کۆلیان دەبێتـەوە ، بـە هـیچ جـۆر نالویّ کە مرۆڤ لە حەسودی و لوت بەرزی قوتاڵی بیّ ئـیللا بـەو ئیمانـەی کـە دەست نیشانمان کرد ، چونکە مرۆڤ کە ژیانی خۆی بە توندی بەستەوە بەو جـۆرە ئیمانەو بەبەهەشت و جەهەننەم، بە سزای بیّ دوایی و پاداشتی بیّ دوایی ، ئـیتر نەك بەتەنها حەسودی و تەکەبورو لووت بەرزی و بە فیـزی لـە نێـو دڵ و دەروون جێگەیان نابێتەوە ، بەڵکو هەرچی خراپـەو خراپەکاریـەك و سروشـتێکی خـراپ هەیە دڵ و دەروون و عەقڵ و بیرو هۆش لێی پاك دەبنەوە: (یـا أیهـا النـاس قـد جاءکم موعظةٌ من ربکم وشفاء لما في الصدور وهدىً ورحمةً للمؤمنین) یونس ٥٧

فەرموودەکە ئاراستەی هەموو مرۆڤی سەر ئەرز کرایە لەو ڕۆژەی کـە لێـی دابەزیوە تا ئـەو ڕۆژە ئـەرز کۆتـایی دیّ و پێمـان دەفـەرمویّ ئـەی خەڵکینـە وا ئامۆژگاری و ڕێنمایی تەواو و ڕاستان لە خـوای خۆتانـەوە لـە لای پـەروەردگاری خۆتانەوە بۆ هـات و ئـەوجا وەریبگـرن، نـەك هـەر ئەوەنـدەش بـەڵکو دەرمـانی

بنەبڕکەر و چارەسەرکەری هەموو نەخۆشیە کوشندەکانی دەروونە وەك حەسوودی و لووت بەرزی و پارەو ماددە پەرستی و خیانەت و هەموو بەد ڕەوشتیەکان .

بەڵێ تەنهاو تەنها ئیمانی بە یەقینی خوای گەورە ئەو ئیمانەی کە خوای گەورە پێی ڕازیە ( نەك ئیمانی صۆفیانە ) مرۆڤ دەکا بەمرۆڤ و لە هەموو حەسودی لووت بەرزی و دڕندایەتیەك و خیانەت و بەدرەوشتیەك دەیشواتەوە، لەبەر ئەوەی ئەو کاریگەریە دەروونیەی کە ئیمان یەقینی دەیکاتە سەر مرۆڤ یەکجار کاریگەرترە لە هەواو هەوەس و هۆگری دەروون بە ڕەوشت و سروشتە خراپەکانی مرۆڤ ، ئەوەیە کە یەکسەر مرۆڤ دەگۆڕێ لە حاڵەتێکی تاریکی یەکجار چڕ بۆ ڕووناکیەکی یەکجار ڕۆناك ، خوای گەورە ( جل جلالە ) دەفەرموێ : بسم الله الرحمن الرحيم ( والعصر إن الأنسانُ لفي خُسْر إلا الذين آمنوا وعملوا الصالحات وتواصوا بالحقِّ وتواصوا بالصبر )

واتا: هەرهەموو مرۆڤێك خەسارەت مەندە لەهەردوو ژیان ژیانی دونیایی و ژیانی دوایی، لە ژیانی دونیا خەسارەت مەندە ، دۆڕاو و ڕیسوایە بەهۆی چیەوە؟ بەهۆی کردەوە پڕ گوناهەکانی وەك حەسودی و لووت بەرزی و خیانەت و خۆفرۆشی و هەموو سروشتە بەدەکانی ، تەنها ئەو کەسانە نەبێ کە ئیمانیان هێناوە بە خوای گەورە ، ئیمانێکی یەقینی ئەو ئیمانە چۆن بزانین یەقینە کاتێ دەزانین کە خاوەنەکەی خۆی بە ماددە نەفرۆشێ و لە حەسودی و لووت بەرزی و خیانەت و بەدڕەوشتی دوور کەوێتەوە ، لە پێناوی خوای گەورە دەست کا بە بانگ هێشتنی خەڵك و ئەمر بەچاکە و نەهی لە خراپە بکا ، بۆخۆشی مەڵبەندی چاکە و کردەوەی چاك بێ بەبێ ڕیایی بۆ خوای گەورە، لە هەمان کات دا سوپایەکی بەپشووبێ لەبەرامبەر کارو کردەوەی خراپ .

# هۆی چییه کەم و کوڕی و عەیبیمان بەرامبەر ئاینی ئیسلام پەیدا کردیه؟

بەر لە هەندێ لەسەر شێوەی خەبەر ئیشارەم بۆ ئەو بابەتە کرد ، وا لێرە بە یارمەتی خوای گەورە لێی دەدوێم . لە پێشتر گوتم تاغووتەکانی فارس و تورك و عرەب کە خۆیان بە موسڵمان دادەنا ئێستاش خۆیان هەر بە موسڵمان دەژمێرن کاریگەریەکی زۆر گەورەو ترسناکیان لەسەر ئێمەی موسڵمانی کورد دروست کرد بۆ ئەوەی ئێمە بە عەمدەن لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام دوورخەنەوە، ئەوسا ئەو دوورخستنەوەیە بکەن بە بیانگەیەکی شەرعی و لە پەنایدا قەتل و عامان بکەن و کوردستانمان لێ چۆڵ بکەن . هەموو مان دەزانین ئەو تاغوتانە لەهەر سێ گەلەکە ( فارس و عەرەب و تورك ) هەرگیز بەدرێژایی مێژوو هیچی چاکیان بەرامبەر نەکردین بەڵکو هەرچی خراپە و تاوان و بەدڕەوشتی هەیە ، لەبەر بێ دەسەلاتی و بێهێزی خۆمان بە ئێمەیان کرد هەر لە غەصب کردنی نیشتمانەکەمان تا دەگاتە کاول کردنی شارو دێهاتمان تا دەگاتە زیندە بەچاڵ بەدەیان هەزارانمان تا دەگاتە سووتاندنی دارستان و تەقاندنەوەی کانی و کانیاوەکانمان تا دەگاتە دەست درێژی کردن بۆ سەر ئابرو و ناموسمان تا دەگاتە ڕەش کردنەوەی هەموو ئەو نیشانە و بەڵگانەی ( معالم ) کە بوونێکی سەربەخۆیان بۆ دیاری کردووین و لە گەلانی تر جیای کردینەوە وەك زمانە شیرینەکەمان ، تا دەگاتە بەتالان بردنی ماڵ و سامان و مێگەل و مەڕ و بزنەکانمان و گارانی ڕەشەولاخمان هەموویان لەگەلا کردین بەزیادەوە ، تاکو ئەمڕۆش لەسەر ئەو گوناح و ستەمانەیان بەردەوامن و سوورن لەسەری ، تاکو ئەمڕۆش زیاتر لە نیوەی خاکی کوردستانیان غەصب کردیە هاولاتی خۆیان لێ جێ نشین کردیە

ئەو زوڵم و ستەمە بێ ئەندازەی کە لێیان کردین و تا ئێستاش لێمان دەکەن وای لە دەیان هەزار بەڵکو سەدان هەزار کوردی لاوی قوڕپەسەر و نەزان کرد کە لەو ئاینە پیرۆزە ( ئاینی ئیسلامی پیرۆز ) دوورکەونەوەو بێنە سەر ئەو بیر و باوەڕە کە گاور چاکترن لە گەلانی فارس و تورك و عەرەب و بڵێن: چما ئیسلامەتی ئەوەهایە ئەو سێ گەلە لە بەرامبەر ئێمەی دەکەن؟ ئەوانە لە کنەخۆی وابێ موسڵمانن ئەوهایان بەسەر ئێمە هێناوە، ئەوسا ئێمە چۆن دێینە سەر دینی ئەوانە؟ سەیرە وا گاور لە دووری هەزاران کیلۆمەترە هاتووە ئێمە دەپارێزن لە دەست گەلانی فارس و تورك و عەرەب کەواتە بۆ ئەو گاورانە چاکتر نین لەو موسڵمانانە؟

خوێنەری بەڕێز لەبیرتە یا لەبیرت نەچێ کە پێشتر گوتم ئیسلام بەرپرسیار نیە لەهەر تاوان و گوناهێك کە موسڵمانان ئەنجامی دەدەن ، چونکە ئەو هەموو جۆرە خراپیەکی حەرام کردیە و عیقابی بۆ داناوە هەروەك چۆن هەموو چاکەیەکی حەلاڵ کردیە و پاداشتی بۆ دانایە. بەڵام ئایا هەموو کەس دەبێتە ئیمامی شافیعی ( ڕەحمەتی خوای لێ بێ ) ئەو ڕاستیە بزانی؟ نەخێر کەواتە خەڵکانکورد و غەیری کورد سەیری واقیع دەکەن بەشیکردنەوە و لێکۆڵینەوە هەڵناستن وەك کامیرا واتە تەنها بەشی دەرەوەی شت

بە نیوەیی دەگرن و هەموو تاوانەکانی تاغووتە فارسەکان و عەرەبەکان و تورکەکان لە دژی ئێمەی موسڵمانی کورد دەدەنە پاڵ ئیسلام ، الحمد لله کە ئیسلامیش لێی بێ بەریە .

ئەوەی کە پێویستە باس بکرێ ئەو تاغووتانە تەنها لەبەر ئەوە بڕیاری لەناوبردنی ئێمەیان دایە چونکە کوردین و خوای گەورە بە ویستی خۆی لە نێو هەموو زمانان زمانی کوردی بە ئێمە بەخشیە و ئێمە لەبەرامبەر ئەو ویستەی خوای گەورە هیچ ویست و دەسەلاتێکمان نیە هەروەك هەموو گەلێك لەبەرامبەر

ئەو ڕاستیە حاڵی حاڵی ئێمەیە کەواتە دەبوایە بە ویستی خوای گەورە ڕازی بان و هەرگیز هەوڵی لەناوبردنیان نەدابایین. لەبەر کورد بوونمان لەلایەن خـوای گـەورە بە ئێمە ڕازی نین کەواتــە بەویـستی خـوای گـەورە ڕازیـنین و لــە خـوای گـەورە هەڵگەڕاونەتەوە کە گەلێکی بەناوی کورد لە نێویان دروست کردیە

هەروەها پێویستە ئەو گەلە موسڵمانانە زۆر چاك بزانن کە ئێمەی کـورد لــە ژێر سێبەری ئەوان ژیاوین و پـەروەردە کـراوین بــە پــەروەردەی ئــەوان لــە لایــەن تاغووتەکانیانەوە ، کە بێ گوومان پەروەردەکەیان زێـدە پــەروەردەیکی دوورە لــە مرۆڤایەتی وەك کابرایەکی بەد ڕەوشتی سەرسەری و قوماریباز ڕۆڵەکانی لە سـەر شێوەی خۆی پەروەردەکا، کەواتە ئەو باوکە بەرپرسیارە لە ناپەسـندی ڕۆڵـەکانی، ئێمەش هەر عەیب و عارو کەم و کوڕیەکی کە لەبەرامبەر ئاینی ئیسلامی پیرۆز هەمانە ئەو تاغووتانەی فارس و تورك و عەرەب لەسـەریان پـەروەردە کردینــە و لێڕاهێنناین، بە پلەی یەکەم ئەوان بەرامبەر خوای گەورە و مێژوو تاوانبارن. ئێمە بە درێژایی مێژوو وەك منالێکی هەتیووی بێ باوك بووینە کە بـاوکی مردبـێ و میراتێکی زۆری لەپاش بەجێ مابێ کەوتبێتە بەردەستی ستەمکارێکی دڵ ڕەقـی بێ بەزەیی قوماریباز ، ئاخۆ ئەو منـاڵە چی لێ بەسەر دێ ئایا

ئەگەر ئەو تاغوتانە لەسەر بەرنامە پیرۆزەکـەی خـوای گـەورەبان و کاریـان پـێ کردابــا وەك عومـــەری کــوڕی خــەتاب ، ئایــا ئــەو کــەم و کوڕیانــەمان دەبــوو لەبەرامبــەر ئــەو ئایینــە پــیرۆزە؟ بــێ گوومــان نــەخێر، ئایــا ئــەو هــەموو لاوە ڕۆشنبیرانەمان پشتیان لە ئیسلام دەکرد؟ نەخێر، سوپاس بۆ خوای گەورە لەگـەڵ ئەوەش کە زۆرانێك لە لاوانی ڕۆشنبیر پشتیان لە ئیسلام کردیە بـەلاَم لاوانێکـی زۆریشمان ئەمڕۆ بەردی بناغەی ڕابوونی ئیسلامن دەبێ فەرموودەی خوای گـەورە هەر بێتەدی (إنا نحن نزلنا الذكرَ وانّا لهُ لحافظون) الحجر ٩

تاغووتـەکانی ئـەو سـێ گەلـە موسـڵمانە لەگـەڵ بەشـێکی زۆر لـە پێهەڵخەڵەتاوە ڕەگـەز پەرسـتەکانی وەك خۆیـان ئاسـا هـەموو چـاکەو کـردەوە باشەکانی کورد لە مێژووی ئیسلام لەبەرامبەر موسڵمانان دەشارنەوە بـۆ ئـەوەی وەك لە پێشتر گووتم ڕێگـەی لـەناوبردنمان بـۆ خۆیـان خـۆش بکـەن وەك ئـەوی پێشتریش ئیشارەتم بۆ کرد و بۆ وەبیر هێنانـەوە دووبـارەی دەکەمـەوە کـە ئێمـەی موسڵمانی کورد یەکەمین گەلین لە ڕۆژهەلاتی ئیسلام بـەبێ کوشـت و کوشـتار موسڵمان بووین ، بێ ئـەوەی پێغەمبـەری خۆشەویـستمان دیتبـێ، لەسـەردەمی (عومەری کوڕی خەتاب) ڕەزای خوای لێ بێ موسڵمان بـوو واتـا چـەند سـاڵێك دوایی کۆچی دوایی (محمد)( علیه الصلاه والسلام ) وە لە دوای شەهید بوونیشی کەس نەی بیستوە تاکە کوردێك لە ئیسلام هەڵگەڕابیتـەوە وەك بـرا عەرەبـەکان بەتایبەت قورەیشیەکان کە پێغەمبەر ( علیه الصلاه والسلام ) لەوان بوو لەگەڵ ئەوەشا بیست و سێ ساڵ لە دژی جەنگان و هەوڵی کوشـتن و لـەناوبردنیان دەدا ، وە لە دوای کۆچی دوایی بەدەیان هەزار عـەرەب بەتـەنها لـە نیمـچە دوورگـەی عەرەب هەڵگەڕانەوە و بەهەزاران صەحابەی پیرۆز و گەورەیان شەهید کرد لـەژێر ئالای پێغەمبەرە درۆزنەکانیان وەك (تولەیحـەی ئەسـەدی، موسـەیلەمەی درۆزن (کـذاب ) ، ئەسـوەدی عەنەسـی ، سـوجاح ژنـە جادوکەرەکـەی موسـەیلەمەی درۆزن)، وە لە دوای موسڵمانبوونمان چووینە ژێر ئالای پـیرۆزی ئیـسلام و ڕۆڵـەی ئەو تۆمان لێ لەدایك بوو بە ئیزنی خوای گەورە کەبتوانی لە ساڵی ٥٨٣ کۆچی شاری قودسی پیرۆز لە دەستی خاچ پەرستەکان ئـازاد کـا کـە ئـەویش (صـلاح الدینی ئەیوبی) یە کە بەزۆری زۆردار دەیانـەوێ بیکـەن بەعـەرەب و لـەکوردی بشۆرێنن تاکو تەواو ڕێگەی قەلاچـۆکردنمان خـۆش کـەن و لـە هـەموو چـاکە و پیاوەتیەك و لە هەموو خزمـەت گوزاریـەك کـە بـە ئیزنـی خـوا پێشکەش بـە ئیسلامان کردیە ڕووت و ڕووتمان کەنەوە بـەلام :(وقـدمکروا مکـرهم وعنـد الله

مكرهم وإن كان مكرُهم لِتزول منهُ الجبال) ئيبراهيم ٤٦ ، (وحاق بالذين ظلموا ماكانوا به يستهزئون )

بەلاّم بالەگوێی خۆیان بنووسن خوا گەلێ لەناو نەبا هەرگیزاو هەرگیز بەکەس لەناو ناچێ ، ئێوە سەیر کەن کورد بەدرێژایی مێژووی خاوەنی هیچ دەسەلاّتێکی ئەو و تۆ نەبووە و بەشی هەر تێهەلّدان و کوشتن و بڕین و دەربەدەری بووە. مەگەر ئەو چەند سالّەی سەردەمی (عومەری کوڕی خەتاب) ڕەزای خوای لەسەر بێ ، یان لە هەندێ ماوەی کورت لەدوای (عومەری کوڕی خەتاب) ئەگەرنا بە درێژایی مێژوو هەر قوڕی بەسەری بووە کەچی خوای گەورە هەر کۆتایی پێ نەیناوە ئەگەرچی لە مێژوو بەچەندان گەلانی لە کورد بالاّتر و خاوەن دەسەلاّت تر لەناو چوون و ئاسەواریان بڕاوەتەوە .

## ئایا مەلای خەتیّ تاونبارە؟

زۆرن ئەوانەی کە (مەلای خەتیّ) خوا لێی خۆش بیّ ، تاوانبار دەکەن بەوەی کە بوویتە هۆی ڕووخانی (میری سۆران) میرنشینی سۆران کە پایتەختەکەی شاری (ڕەواندوز) بووە، کە گوایە فەتوایەکی دەرکردیە کە هەرچی بە گژ خەلیفەی عوسمانی دابیّ کافرە

باوەڕ کردن بەو درۆ و بوهتانە دەگەڕێتەوە بۆ ساویلکەیی و خۆش باوەڕی گەلەکەمان وەك لە پێشتر ئیشارەم بۆ کرد، بیّ گومان مرۆڤ هەردەم لەسەری پێویستە موسڵمانێکی زێدە تێگەیشتبیّ تا بەقسەو درۆ و دەلەسە و بوهتانی درۆزنان و دوژمنانی ئیسلام باوەڕ نەکا، لەو حاڵەتە یەکسەر ئەو ئایەتە پیرۆزە بهێنێتە پێش چاوی خۆی کە دەفەرمویّ: (یا أیها الذین آمنوا إن جاءکم فاسق بنبأ فتبینوا أن تُصیبوا قوماً بجهالة فتُصبحوا علی ما فعلتم نادمین) الحجرات، ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان بە خوای گەورەیە ئەگەر درۆزن و بڕوا لاوازێك هەواڵێکی بۆ هێنان یەکسەر پێی باوەڕ مەکەن تا ساغی نەکەنەوە و دوایی کەسانێك بە جەهالەت و سوورنەکردنەوەی هەواڵەکە بەر بەلاّدەکەن و ماڵ ویران دەکەن کە پەشیمانی لە دوایە

ئەوانەی مەلای خەتیّ تاوانبار دەکەن باوەڕ ناکەم یەك تاکە نەفەریان ئاگاداری ڕاستی بیّ ، باوەڕ ناکەم بزانن مەلای خەتیّ کیّ بووە ، وە پەیوەندی بە میر (محمد) پاشای کۆرەوە چۆن بوە، وە کەنگیّ ئەو فەتوایەی دەرکردیە و بۆچی دەری کردیە، هەرئەوەندە درۆیەیان لایەکە ئەو مەلایە بەیەك تاکە فەتوا میرنشینێکی گەورەی کوردی لەناوچەی باڵەکەتی تاواندۆتەوە

بەڕێز مامۆستا (مسعود محمد) جەلی زادە لە بەرگی دووەمی حاجی قادری کۆیی چاپی ( ١٩٧٠ ) ئەو مەسەلەی زۆر باش ڕوون کردیتەوە و

دەڵێ: مەلای خەتێ (گوندی خەتێ) مەلایەکی زێدە لێهاتوو زاناو شارەزای شەرع بوو، لەبەر ئەوە پاشای کۆرە بە قازی خۆی دامەزراندبوو، دائیم بەلای خۆیەوە بوو لەسەر یەك سفرە بەیەکەوە نانیان دەخوارد و هەموو پرس و ڕایەکیشی بەو بوو مەلای خەتێ مەلایەکی بێ دەسەلات بوو تاکە چەکی شەرع و زانیاری ئیسلامی بوو، کاتێ کە پاشای کۆرە میرنشینەکەی گەورەو بەهێز بوو خەریك بوو هەموو کوردستان بگرێتەوە ، دەوڵەتی عوسمانلی مشەوەش بوو هەروەها هاوپەیمانە بەهێزەکەی (ئەڵمانیا) کاتێ کە دەوڵەتی عوسمانلی داوای لە ئەڵمانیا کرد کە یارمەتی بدا، یەکسەر داواکەی قبوڵ کردو دەوڵەتی عوسمانلی ئینزارێکی زۆر توند و تیژی بۆ پاشای کۆرە نارد کە بێ گومان دەوڵەتی ئینگلیز و ئێرانیش لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی بوون بۆ هاوکاری کردنی لە پێناو تێکدانی میرنشینی پاشای کۆرە ، بە کورتی بڵێین پاشای کۆرە خۆی داوای لە (مەلای خەتێ) کرد کە ڕوو لەگەلی کورد کاو هەروەها ڕوو لە سوپاکەی پاشای کۆرە نەکەن لەبەرامبەر ئەو سوپایەی کەوا بەڕێکەوتووە لە ئەستەنبوڵەوە بۆ کوردستان بەرەنگاری بکەن و بەڵکو بلاوەی لێ بکەن ، چونکە هەرکەسێ شەڕ لەگەڵ خەلیفەی ئیسلام بکا لەدین دەردەچێ . بەڵێ پاشای کۆرە خۆی ئەو داوایەی لە مەلای خەتێ کرد چونکە دەیزانی سوپاکەی کورد ئەو سوپایە نییە خۆی لەبەر سوپاکەی عوسمانیان و ئەڵمانەکان بگری ئەگەر بێت و بەرەنگاریان بێتەوە ئەوە لەوانەیە هەموو کورد لەناوچەی کوردستانی باشوور لەناوچێ ، لەبەر ئەوە میرنشینەکەی کردە قۆچی قوربانی هەموو گەلی کورد، مەلای خەتێ زۆر چاك ئەو ڕاستیەی دەزانی بۆیە کە داواکەی پاشای کۆرەی قبوڵ کرد. بەڵگە لەسەر ڕاستی ئەو فەتوایە بەوشێوەیە ئەوەیە: کە مەلای خەتێ مەلایەکی سوڵتانی عوسمانی نەبووە لە دووری پتر لە دوو هەزار کیلۆ مەتر ئەو فەتوایە دەرکاو منەتی پاشای کۆرە نەزانی . مەلای خەتێ هەر لەناو قەسری پاشای کۆرە و لەتەك پاشای کۆرە ئەو فەتوایەی دەرکرد و لەدەستی ڕای نەکردبوو .

نە مەلای خەتێ هێندە بەدەسەلاَت بوو سەرپێچی بڕیار و ویستی پاشای کۆرە بکاو منەتی نەزانی نەپاشای کۆرەش هێند بێ دەسەلاَت و بەزەیی بوو کە دەستی نەگاتێ ، پاشای کۆرە ئەو پاشا کۆرەیە بوو کە مامی خۆی لەسەر زەعامەت کوشتبوو ئەوجا چۆن مەلایەکی بێ دەسەلاَت و بێ کەس هەمیشە لەتەك خۆی بێ دەتوانێ سەرپێچی بڕیار و هەواو هەوەسی بکا

لەدوای نەمانی میرنشینەکەی سۆران مەلای خەتێ بەوپەڕی هەژار و بێ دەسەلاَتی گەڕایەوە گوندی خەتێ و تا ڕۆژی مردنی هەر بە هەژاری ▪ سەلامەتی ژیاو ژیانی بردە سەر . ئایا ئەگەر مەلای خەتێ لە ڕێگای خیانەت و خۆفرۆشی ئەو فەتوایەی دەرکردبا داخ لە دڵێك نەبوو لە دڵسۆزانی پاشای کۆرە خەنجەرێکی لەسەر دڵی دا خۆ کەس نەبوو دیفاعی لێ بکاو بیپارێزی لەو گوندە بچوکەی خەتێ لەدوای ئەوانەش هەموو ئاشکرایە لەسەردەمی عوسمانلی هەر کوردێك وشەیەکی چاکی بۆ سوڵتانی عوسمانلی کردابا لەبەردەمی سوڵتان لە ئەستانبۆڵ ئەوە سوڵتانی عوسمانی هێندە پاداشتەی پێ دەبەخشێ کە تاوەکو ئەمڕۆ نەوەکانی بیخۆن بەتێری کەچی کەس نەبوو و تا ئێستاش کەس نەیتوانی بڵێ مەلای خەتێ پولێکی وەرگرتبێ لە سوڵتان لە بری ئەو فەتوایە. کەواتە فەتوایەکە تەنها بۆ بەرژەوەندی تێکڕای گەلی کورد بوو .

پرسیار: ئەی میرنشیەنەکانی دیکەمان شۆڕشەکانی دیکەمان خۆ چ مەلای خەتێ فەتوای نەدابوو کە ئەو میرنشینانەو شۆڕشانە دژ بە خەلیفەی ئیسلامن یاخود مەلای وەك مەلای خەتێ ئەو فەتوایەیان لە دژ

دەرنەکردبوو ، وەك چۆڵ کردنی هەموو خاکی کوردستانی باشوور لە ساڵی (١٩٩١) کە نزیکترین ئەو شۆڕشانەیە لێمانەوە ، ئایا بە فەتوای کێ هەموو کوردستان چۆڵ و هۆڵ کرا؟ هەموومان دەزانین تەنها بەیەك دوجار هاوار کردن (هەڵێن هات) چۆڵ کرا فەتوای (هەڵێن هات) کێ دەری کرد؟ وەلاَمم دەنەوە .

جگە لە تاوانبارکردنی مەلای خەتێ بەگشتی ئەمڕۆ زۆربەی کورد مـەلاکان تاوانبار دەکەن کە گوایا تاکە کەسانێ بوون کە مامۆسـتا بـوون لـە نێـو گـەلی کـورد ، بـەلاّم چ مامۆسـتایەك فریـان بـە سـەرکردایەتیەوە نـەبوو تـەنها داوای نوێژەکانیان لە خەڵك دەکرد بۆ بەرژەوەندی خۆیان لـە پـەنا ئاغـا و کوێخاکـانی کوردستان ژیانی خۆیان دەبردە سـەر و شـەرعیان بـۆ خـوار دەکردنـەوە ( شـەرع بەکەس خوار ناکرێتە ) و بانگ هێشتی ئەوان بۆ خەڵك لە دوای نوێژەکان تـەنها ئەوە بوو تەنها خەڵکیان فێـری تەمـەلی و تـەوەزەلی و تـەوەکول بـەخوا دەکـرد ، خەلکیان لە عیلم و زانست دورر دەکردەوەو فێری بێ دەسـەلاّتی و مـل کەچـیان دەکرد لەبەرامبەر حوکمڕانانی ولاّت، بێ ئاگـاو خەبـەر بـوون لـە پێـشکەوتن و گەشە کردنی دونیا ، لە گوێی گادا نووستبوون و زۆربەیان هاوکار و خزمەتکاری شێخە ستەمکارەکانیان دەکرد کە بە هەزارەها دەروێـشیان هـەبوو تـەنها فێـری زەرگ لە خۆدان و ڕیشی درێژی پڕ لە ئەسپێ و هەیاو هویان کردبوون .

من نالێم ئەو شتانەی گوتراوە لەبارەی مەلاکانی کوردسـتان درۆیـە ، بـەلکو زۆربەی ڕاستە ، بەلاّم ئەوەی ڕاستی بێ لەبارەی ئەو مەلایانە زۆربەی هەرە زۆریـان کۆلکە مەلا بوون وفڕ لە ئیسلام نەگەیشتوونەو هیـچیان لەشـەرع و گـەورەیی قورئانی پیرۆز نەزانیە ، بێ گومان ئەو جۆرە مەلایەش گـەل هـەر بـەرەو هەلّـدێر دەبا.

بەلاّم نابێ ئەوەشمان لەبیرچێ کە مەلای زۆر چاك و زاناو داناو ئازامان هەبووە کە بەڕاستی لە ژێر سێبەری کیتاب و سوننەت ( الحمـد لله ) پێگەیـشتونە وەك مەلای گەورەی کۆیە (مەلا محمد ) ی جەلی زادە خوای لێ خۆش بێ کە زانایـەکی زۆر شارەزا بووە لە ئیسلام و شیعر و هەلّس و کەوتـەکانی بەلگـە بـوون لەسـەر ئەوە کە بە حەقیقەت موستەحەقی ئەوە بێ پێی بگوترێ (مەلای گەورەی کۆیـە) وابزانم تاکە کەس لە هەموو کوردستان لە کاتی (مؤتمر الصلح فی باریس ) لـە دوای کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم دەنگی خۆی هەلّبڕێ گووتی: (با ئێمـە خـۆ

ئامەدەکەین هاوبەشی لەو کۆنگرە بکەین هەروەك گەلانی ژێر چەپۆکی عوسمانیەکان و داوای سەربەخۆیی خۆمان بکەین هەروەك چۆن نوێنەری ئەو گەلانە ئامادە دەبن لەو کۆنگرە و داوای مافی سەربەخۆیی خۆیان دەکەن ) دوای ڕووخانی عوسمانیەکان بە هۆی ئەو جەنگە (جەنگی جیهانی یەکەم) بەلاّم هیچ پشتگیریەکی لەلایەن کوردەوە نەبوو بەداخەوە .

وە لە زاناو مەلا بەناوبانگەکانمان بەردی بناغەی کوردایەتیان لە کوردستان، دارشت حاجی قادری کۆیی و پێش ئەویش بە سێ سەد ساڵ یا پتر (ئەحمەدی خانی ) . دە کوردینە ئەگەر ئێوە بەڕادەی ئەوەی دوژمنی کۆلکە مەلایەکانی کوردستانن و نەفرەتیان لێ دەکەن و زانیتان کە خراپ بووین و هۆی دوا کەوتنی گەلی کورد بوونە لەسەر وەختێك لە مێژوو ، بە هەمان ڕادە ببنە دۆست و قوتابی (احمدی خانی) و (حاجی قادر) و بە ئامۆژگاری و ڕێنمایەکانی بکەن و پەیڕەوی ڕێبازەکانیان بکەن لە کوردایەتی مادام هێندە بە پەرۆشن بۆ کورد و کوردستان و کوردایەتی .

ئەوەشتان لەبیر نەچێ کە مەلایەکانمان لەسەردەمی خۆی مەلای خراپ بوون و فێری تەمەڵی و جەهل و نەفامی و تەوەکول و کونجی قەناعەتیان کردبن ئەی مامۆستاکانی ئەمرۆش چیان فێر کردوون چۆنیان دەرس داون

و چیان دەرس داون؟ بۆ وەسفکردنی مامۆستاکانی ئەمڕۆمان نمونەیەکی کورت دەهێنمەوە: بیرو ڕاتان چیە بەرامبەر مامۆستایەك لە کاولە خانوویەك دا بژی، خۆی و چوار پێنج کچی و دووسێ کوری و هەر چوار دەوری ماڵەکەی گەمارۆدرابێ بەو چەکدار و پیاو خراپە دڵ ڕەق و خوێن ڕێژانەی کە بەدوا ڕاوکردنی ئەو جۆرە خێزانانەدا دەگەڕێن، لەو ساتە پڕ مەترسیە کە کەسێ نیە یارمەتیان بداو ڕزگاریان کا کابرای مامۆستا ڕەقس و سەماو زوڕنا لیدان و هەڵپەڕکێ فێری ژن و ماڵ و منالەکانی بکا؟ ئەو مامۆستایەتان پێ چۆنە؟ (والسلام علی من اتبع الهدی) طه ٤٧.

## شیمانە هەیە کورد بتوانێ ببێ بەدەوڵەت؟

من ناڵێم شیمانە ( احتمال ) نیە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆمان، بەڵام ئەو شاکارە ئەورۆ لە هەموو ڕۆژگاری ڕابردوو زەحمەت ترە، بە بیرو بۆچوونی من زۆر کوردی دیکەش یا زۆر خەبەردارانی جیهانی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی دووسەد ساڵ بگرە سەد ساڵێك پێش ئەمڕۆ گەلێ لەمڕۆکە هاسانتر بوو لەبەر ئەوەی:

١- پێویست بە ئیعتراف و دان پێداهێنانی وڵاتانی زل هێز و ئەورووپی نەبوو گرنگ ئەوە بوو خۆمان بە هەموو شێوەیەك سووربایین لەسەر دامەزراندنی ئەوسا با هیچ دەوڵەتێك ئیعترافی پێ نەکردبایین واتا: هۆکاری دەرەکی هێندە کاریگەری لەسەرمان نەبوو وەك ئەورۆ کە بەڕێژەی سەدا نەوەد و نۆ کاریگەری لەسەرمان هەیە

٢- پێویستمان بە کۆبوونەوەی (ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان) نەبوو بەڵکو ئەو ڕێکخراوەیە ئەوکات هەر نەبوو چونکە لە دوای جەنگی جیهانی دووەم دروست کرا، هەروەها ڕێکخراوی (عصبە الامم) یش نەبوو

چونکە ئەویش لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم دروست کرا واتا ساڵی (١٩١٩).

٣- وڵاتە زل هێزەکانی وەك بەریتانیا و فەرەنسا و ڕووسیا و ئەمریکا لەو بارو دۆخە دا نەبوون وەك ئێستا کاریکەر بن و بتوانن کار بکەنە سەر ئیرادە و سووربوونی گەلێکی وەك کورد کە نەهێڵن دەوڵەت دروست کا ئەگەر کورد تەنها خاوەنی یەکگرتن با ئەو سەردەم دەوڵەتی کورد زۆر بە هاسان دەهاتە کایەوە.

٤- ئەو چەك و ئامێرانەی جەنگ کە بەدەست دوژمنەکانمانەوە بوو ئێمەش دەمانتوانی بەدەستی بهێنین وەك ئەمڕۆ نەبوو دوژمنەکانمان هەموو هێزێکی ئابووری و لەشکریان لەبەر دەستایە و ئێمەش هیچ ، بەڵکو وەك سواڵ کەرین لەبەردەم دەوڵەمەندترین بەفیزترین دەوڵەمەند

٥- ئەوسێ دەوڵەتە کە زل هێزن ئێستا لە ئەوروپا (بەریتانیا ، فەرەنسا، ڕوسیا) لە حاڵەتێك دا نەبوون کە بتوانن لە بەرامبەر سوور بوون وتێکۆشانی کورد لە پێناو دامەزراندنی دەوڵەتێکی کورد هیچ شتێکی ئەو تۆ بکەن، چونکە لە ڕووی ئابووری حاڵیان زۆر خراپ بوو و تازە بەتازە لەشەڕە گەورەکانی ناپلیۆن کە ئەورروپای لەبن هێنا بوو دەستیان بەر بووبوو ئەوە ئەگەر باس لە مێژووی دووسەد ساڵێك بەر لەمڕۆ بکەین، ئەگەر بگەڕێینەوە دواتر ئەوە بارو دۆخیان لە هەموو لایەکەوە خراپتر بوو ، بەڵام کار بەنیسبەت ئەمریکا چۆن بوو؟ ئەمریکا جارێ زۆر دوور بوو کە بتوانێ دەست بخاتە نێو هەراو کێشەی نێوان دەوڵەتانەوەو هێشتان برینی شەڕی ناوەخۆی چاك نەبیوّوە کە زیاتر لە دوو سەد هەزار کەسی تیا کوژرا، ئەمریکا تا دوای جەنگی یەکەمی جیهانی ڕۆڵێکی ئەو و تۆی نەبوو.

٦- دەمان توانی لەو سەردەم ئاینی ئیسلامی پیرۆز بکەینە بەهێزترین چەك بۆ گەیشتن بە هەموو ئاوات و ئامانجە ڕاستەقینەکانمان کە یەك لەوان دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بوو، ئێمە ئەگەر بەدوا وەدەست هێنانی هەر کارێکی شەرعی دابچین ئەوە خوامان لەگەڵە وەك تێکۆشان لە پێناو دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی وەك هەموو گەلانی موسڵمان، کە مادام دەوڵەت یەك لە نیعمەتە هەرە گەورەکانی خوای گەورەیە بۆ گەلانی سەر ئەرز ئەو کاتە وەدەست هێنانی لە ڕێگەیەکی شەرعیەوە مافی خۆمانەو شەرع ئەو مافەی پێ دەدا ، دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لەسەر خاکی خۆمان ئەو خاکەی کە هەزاران ساڵە خوای گەورە پێی بە خشیوین و لە کەسمان زەوت نەکردیە ئەرکێکی شەرعیە و خۆ دزینەوە لێی تاوانە چونکە دەبێتە هۆی ڕیسوا بوون و کۆیلایەتی و چەوساندنەوە کە هەموو ئەو شتانە خوای گەورە پێی ناخۆشە و نەهی لێ کردیە .

٧- لەو سەردەمەدا خاکی کوردستان بە هیچ جۆرە دوژمنانێك کۆنترۆڵ نەدەکرا تەنها خیانەتی خۆمان نەبێ ، چونکە هێشتا ئەو تەکنەلۆجی و چەکەی

ئەورۆ هەیە لە خەونی شەوانی کەس دا نەبوو، کە بێگومان جێگەی ترسە و هۆکارێکی گەورەیە بۆ داگیرکردن و کۆنترۆڵی وڵاتی داگیر کراو، بە کورتی لە لایەنی سوپایی ئەگەر دوژمنەکانیشمان لە ئێمە بەهێزتر بان نەیان دەتوانی هەموو کوردستان پارچە پارچەکەن و زەوتی بکەن بەمەرجێ وەك لە پێشتر گووتم خیانەت ڕەگی لەنێو دا نەکوتابایین.

نابێ ئەوڕاستیانەش لەبیرچێ کە لەو سەروەختیش گەلانی گەلێ لە ئێمە ژمارە کەمتر و زەوی بچووکتر هەبوون و کەچی لە نێو کۆنگرەی دەوڵەتانی کە لە خۆیان زۆر بەهێز تر بوون دەوڵەتیان لە دەست نەداو بەری هەموو بارو دۆخ و بەسەرهاتێکی سامناکیان گرت و خۆیان نەدۆڕاند. با کەس لە ئێمە بیری بۆ ئەوە نەڕوا کە کورد لە هەموو گەلانی دونیا لاوازتر ببوبێ لە بواری ئابووری و لەشکری بۆیە ئەوان بوونە شت و ئێمە نا ، بەڵکو ئێمە تەنها ( وەك لە پێشتر باسم کرد ) بۆخۆمان خۆمان دۆڕاندیە . گەلانی دونیاش بۆخۆیان خۆیان بردۆتەوە، جیاوازیەکە هەر ئەوەندەیەو چیتر نا، بە کوردی کۆییانە (چی دیکە نا) کە دەوڵەتانی زل هێز ئەو دەوڵەتانەی ئەمرۆ نەبوون دەوڵەتانی دراوسێشمان ئەم دەوڵەتانەی ئەمرۆ نەبوون کە بتوانن وەك ئەمرۆ لە دامەزراندنی دەوڵەت ڕێگەمان لێ بگرن . لەسەرەتای شۆڕی ئەیلول (١١/٩/١٩٦١) لەگەڵ یەکەم سەرهەڵدانی شۆڕشەکە زۆربەی شارۆچکەو گوندەکانمان لە ژێر ڕکێفی حکومەتی عێراقی دەرچوون و حکومەت هیچی ئەو و تۆی لەبەرامبەر ئەو دەرچوونە پێ نەکرا ئەگەر چی سەدەی فرۆکە و تۆپ و دەبابەش بوو، ئەی ئەگەر ئەو شۆڕشە پێنج سەد ساڵ بەر لەمرۆ باو هەموو کوردستانی بە یەکگرتنێکی پۆلایین گرتاباوە ئایا دوژمنانمان چیان پێ دەکرا .

## پەیمانی سایکس بیکۆ:

زۆر کەس هەنە لە ئێمەی کورد کە پێیان وایە پەیمانی سایکس بیکۆ گەلەکەمانی کردیە بە چوار پارچە (پارچەیەك بۆ تورکیا، پارچەیەك بۆ ئێران، پارچەیك بۆ عێراق، پارچەیەك بۆ سوریە) ئەو پەیمانە بۆ پێی دەڵێن پەیمانی سایکس بیکۆ؟ لەمیانی کێ بوو؟ (سایکس) وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بوو ، (بیکۆ )وەزیری دەرەوەی فەرەنسا بوو ، بە نهێنی بەر لەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بڕوخێ ئەو پەیمانەیان بە نهێنی مۆر کرد کە هەر کاتێ ئەو ئیمپراتۆریەتە  کە لەو سەردەم پێیان دەگووت

پیاوە نەخۆشەکە لە بەر لاوازی و پەرتەوازە بوونی قەڵەمڕەوەکانی  ئەوە ئەو وڵاتانەی کە لە ژێر دەستی ئەو دەوڵەتە بوون دابەشی کەن بەسەر خۆیان بەبێ ئەوەی کەس ئاگادار بێ ،کە زۆربەی وڵاتانی عەرەبی دەگرێتەوە.

تا ئێستاش زۆربەی کورد وا دەزانی کە کوردستان یەك پارچە بووە و لەو پەیمانە کرایە بە چوار بەش ، لێرەدا دەڵێن ئایا کێ بیستویەتی ئەو چوار پارچە کوردستانە ڕۆژێ لە ڕۆژان یەك پارچە بووبێ بەر لە هاتنە کایەوەی ئەو پەیمانە؟ لەدوای هەندێ  کوردستان خۆ دەوڵەتێکی بەهێزی یەك پارچە نەبووە دەست درێژی بکاتە سەر دەوڵەتەکانی دراوسێ ی و ئیتر بە هەموان گەلەکۆیی لێ بکەن و بیشکێنن و بۆ ئەوەی جارێکی تر نەتوانی دەست درێژی بکا بەمەبەستی هەندی پارچە پارچەی بکەن هەروەك چۆن لە دوای جەنگی جیهانی دووەم ئەڵمانیای هیتلەری دەست درێژکاریانکردە دوو پارچە ئەڵمانیای ڕۆژ هەلات بەبەر پەیمانی وارشۆ کەوت و ئەڵمانیای ڕۆژ ئاوا کە بەبەر پەیمانی ناتۆ کەوت.

دواتر کوردستان هەزاران ساڵ پێش پەیمانی سایکس بیکۆ هەبووە ، دەبوایە گەلێ بەر لەسەر هەڵدانی ئەو پەیمانە چارەی خۆی کردبا، کاتێ ڕاست بوو ئەو پەیمانە کاری تێکردبا و پارچە پارچەی کردابا کە تەنها حەفتەیەك یا مانگێك پێش مێژووی ئەو پەیمانە هاتابا سەر دونیاو شارەزای بە دوونیا نەبا، ئیتر با بەس

بێ لۆمەی کەس نەکەین تەنها خۆمان نەبێ بەداخەوە ئەوەی ئەمڕۆ ئاراتمانە سێ هەزار ساڵ پتر لەدەستمان چووە و ئەمڕۆش بە هاسان نایەتە کایەوە و ئەو کاتە کە نەك تەنها ئیسلام بەڵکو (موسی و عیسی) ش (علیهما السلام) نەهاتبوونە سەر دونیا.

ئەمڕۆش با بەس بێ ژێر چەپۆکی و چەوساوەیی و کۆیلایەتی و نۆکەری بێگانان و خۆ بەکەم زانین لە ئاستیان، با بەس بێ دووبەرەکی و سێ بەرەکی و دەبەرەکی لە ژێر ناوی بریقەدار و هەڵخەڵەتێنەر، با بەس بێ فێڵ لە خۆمان بکەین و بڵێین ئیسلام دوای خستینە و ئیسلام بەرپرسیارە لە نەبوونی دەوڵەتێکی کوردی کە بێگومان بەڵگەی حەق و ڕاست و مێژوویی و واقیعی ئەو بووهتانەی بە ئیسلام دەکرێ بە ئیزنی خوا هەتا هەتایە سەرەو نخومم کردەوە و بە ئیزنی خوا ئەو نووسینەم دەکەوێتە بەردەست هەموو خوێنەرانی کوردی ڕۆناکبیر و دەیخوێننەوە و ئەگەر هەر بیرو ڕایەکی خراپیان هەبێ لەبەرامبەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام لێی پەشیمان دەبنەوە و ئەوسا دەگەڕێن بەدوای ئەو هۆکاری کوشندانەی کە تا ئێستا لێ نەگەڕاوە وەك هەموو گەلانێك لەسەر قاچی خۆمان ڕاوەستین، لێ نەگەڕاوە سنووری کوردستان بە ئاگرێکی بێ دوکەڵ بتەنیین بۆ سووتان و برژاندنی هەر دوژمنێك کە دەیەوێ پێی بخاتە ئەو دیوی سنورمان.، با بەس بێ چیتر بەدرۆ و دەلەسان بەفرت و فێڵی دوژمنان هەڵنەخەڵەتێین گەشتی ژیانمان لەو ڕێگەیەوە دەست پێ بکەین و کۆتایی پێ بینین کە خوای گەورە بۆ دیاری کردین و پێغەمبەرە مەزنەکەمان( علیه أفضل الصلاة والسلام ) بۆی ڕوون و هاسان کردینەوە . با بەس بێ خۆمان بەدەستی خۆمان لە یەکێ لە گەورەترین نیعمەتەکانی خوا بێ بەش کەین کە دامەزراندن و دروست کردنی دەوڵەتێکی کوردیە ، با بەس بێ وەك مامۆستا ( هەژار موکریانی) بە شیعر دەفەرموێ با نەبینە ئەو باڵندە بێ هێز و لاواز و سووکە کە ناو دەمی تیمساح خارێن دەکاتەوە

و هەركاتێ هەوەسی هێنا دەمی پێكدادا بە چەند چركەیە ژیانی لەدەستەدا و هەرگیز چاوی بە ڕووناكی ناكەوێتەوە .

برایانی خۆشەویست و بەڕێز: با لەدوا ووشەی ئەو باسە كورتە پێتان ڕابگەیەنم كە گەورەترین هۆكاری دواكەوتن و ماڵ وێرانی هەر گەلێ نەبوونی حكومەتێكی سەربەخۆ خیانەت و خۆفرۆشیە كە ئایینی ئیسلام زۆر بەتووندی نەهی لێ كردیە و خائین بە موسڵمان دانانێ و ئەوەتا لە سورەتی یوسف دەفەرموێ: (إن الله لايهدي كَيدَ الخائنين) هەروەها لە سورەتی (الحج) دەفەرموێ: (إن الله لايُحب كُلَّ خوانٍ أثيم) ، ئاشكرایە هەردوو ئایەتەكە خائین بە موسڵمان دانانێ، هەركەسێك لە پەنا ئایینی ئیسلام خیانەت و خۆفرۆشی دەكا ئیسلام بەرپرسیار نیە لە خیانەتی ئەو كەسە، وەك لە پێشتر گووتم ئایینی ڕاست و پیرۆزی ئیسلام گوناهبار و بەرپرسیار نییە لە هەزاران تاوان و گوناه و خیانەتێك كە مرۆڤی موسڵمان ئەنجامی دەدا بەڵكو خۆی تاوانبارەو بڕوای بە ئیسلام لاوازە یا بێ باوەڕە، دەبێ ئەو ڕاستیەش بزانین كە هەر موسڵمانێك لە پەنا ئایینی ئیسلام هەڵدەستێ بەهەر تاوان و گوناهێك گەلێ لەو گاورە تاوانبارترە كە بەهەمان تاوان و گوناه هەڵدەستی ، چونكە لە ڕێگەی هەندێ ناوی ئیسلام بەد دەكا كە ئەوش گەورەترین خیانەت و تاوانە لەسەر ئەرز .

# کۆتایی

لە کۆتاییدا داواکارم لە خوای گەورە لەو هەڵانەم خۆش بێ کە لەو نووسینەم تێی کەوتووم ، خوای گەورە لە هەموو گوناهان خۆش دەبێ (... إنه يغفر الـذنوب جميعاً انه هو الغفور الرحيم).

هەروەها داواکارم لە خوێنەری بەڕێز کە بە ووردی بەچاوی بێ لایەنی و بەبێ وەرز بوون و بە ئارامیەکی پێویست و بە دڵێکی فراوان و بە عەقڵێکی ڕۆناك ئەو نووسینەم بخوێننەوە بەر لەوەی هیچ ڕەخنە و تیرو توانجێك ئاراستەی هەست و نەستم بکا و بەبێ زەبیانە بکەوتە دوام هەروەك زۆرکەس بەبێ زەبیانە و بێ بیرکردنەوە ئایینی ئیسلامی پیرۆز تیرە باران دەکەن لە ژێر پەرت و بیانگەی ئەو و تۆ کە هەرگیز فریان بەسەر ڕاستیەوە نییە. خۆ ئەگەر هینەکەی منیش وەك ئایینی ئیسلامی لێ بەسەر هات و لەناو گەلی کورد ئەوە من لە هیچ کەس تووڕە نابم ،چونکە کە ئایینێك لە لای خوای گەورەوە بێ کە داهێنەری گەردوون و گشت بوونەوەر و گیانلەبەرە لە نەبوو ، کەواتە من خۆم و نوسینەکەم چەو دەبمە چی لەنێو ئەو خەڵکە لە چاو خوای گەورە ( سبحانهُ وتعالى عما يقولون علواً كبيراً ) و ئایینە پیرۆزەکەی کە ڕاستیەکی ڕەهایەو تەنها و تەنها سەرکەوتنی مرۆڤ لە دونیاو قیامەت بەستراوەتەوە بە پیتە جوانەکان و ڕاستەکان و کار پێکردنی وەك تاکە بەرنامە لە ژیانی مرۆڤ و ژیانی ئەرز تا ئەو ڕۆژە نەفخی صور لێدەدری و کۆتایی بە ژیان دێ.

ئەو نووسینەم بۆ ئەوە نەنووسیوەکە خەڵك بانگهێشی ئیسلام بکەم و بۆ ئەوەی ببم بە (داعیە)، واتە کەسێك کە خەڵك بانگهێش بکا بۆ ئایینی ئیسلامی پیرۆز ئیسلام ، گەڕانەوەیان لە ڕێگا چەوت و کوێرەکانی ژیان ورزگار کردنیان لە تاریکیەکانی ، بەڵکو مەبەستم تەنها ڕۆنکردنەوەی ڕاستی و بەرگریکردن لە ڕاستیە ، با ئەو ڕاستیەش دوژمنی خۆم بێ . یەك لەو سیفەتە

جوانەکانی زاناو نووسەر و سەرکردە رۆشنبیرەکانی ئەورووپا و رۆژئاوا ئەوەیە کە چاکە و پیاوەتی و جوان مەردی دوژمنەکانیان ناشارنەوە و بۆخۆیان و بۆ خەڵکی تر بەدیاری دەخەن و تەنانەت ستایشیان دەکەن ، وەك ئێمە کورد نین ناحەزی و دوژمنایەتیمان لەگەڵ هەر کەسێ هەبێ رەوشت و هەڵسوکەوتە جوانەکانیشی بە خراپ لە قەڵەم دەدەین و دەیانشارینەوە ، تاکو ئەمرۆ رۆشنبیر و زانای ئەوتۆیان تێدایە کە مەدح و ستایشی (صلاح الدینی ئەیوبی) دەکەن، باس لە ئازایەتی و بەزەیی و رەوشت بەرزی ئەو دەکەن .

سەرکردەی بەناوبانگی ئینگلیزی (مۆنتی گۆمری) کە یەکێکە لە زانا هەرە گەورەکانی نەخشە و پلانی جەنگ لە مێژوو ، لە چەندان شەری گەورە لە باکوری ئەفریقیا رووبەرووی سەرکردە بەناوبانگە مێژوویەکەی ئەلمانیا بۆوە کە ناوی (رۆمل ) بوو ، وابزانم کەس نییە ناوی نەبیستبێ ، کەچی( مۆنتی گۆمری ) لەناخی دڵیەوە ستایشی دەکا و ئاخی بۆ هەڵدەکێشێ کە ( هیتلەر ) بە نارەوا کوشتی ، خۆزیای دەخواست کە دوای جەنگی جیهانی دووەم لە ژیان دا مابا و بەیەکەوە وەك دوو برادەری خۆشەویست جەنگی جیهانی دووەمیان نووسیباوە

بەراستی سیفەتێکی یەکجار جوان پێویستە بۆ مرۆڤ کە یاری راستی و دڵسۆزی راستی بێ تەنانەت بەرامبەر دوژمنەکانیشی . بەهۆی دوژمنایەتی نەچێ بەدرەوشتی ئەوتۆیان بداتە پاڵ کە دوورن لێی ، کەچی

زۆر لە رۆشنبیرانمان بەبێ بیرکردنەوە و بەبێ لێکۆڵینەوە خەریکن گەورەترین و پیرۆزترین و راسترین بەرنامەی خوا تاوانبار بکەن .

وآخر دعواي الحمد لله رب العالمين .

**برای بچوکتان**

**سەردار فەقێ حەسەن**

**٢٠١٠/٨/٩**